# (30) سی خەڵاتی ڕەمەزان

## بۆگۆڕانکاری وداهێنان








نووسینی
م:سیروان شێروانی

# ﴿٣٠﴾ سى خەڵاتى رەمەزان
# بۆ گۆرانكارى و داهێنان

| | |
|---|---|
| نــــاوی کتێــــب | (٣٠) سی خەڵاتی رەمەزان بۆ گۆرانکاری و داهێنان |
| نووســـــــینی | سیروان شێروانی |
| نەخشەسازی نـاوەوە | کۆمپیوتەر (محمد علی) |
| نـۆرەو ســاڵی چـاپ | یەکەم ٢٠١٢زایینی |
| ژمـــارەی ســـپاردن | ٦٤٤ی ساڵی ٢٠١٢ی پێدراوە |

# ﴿٣٠﴾ سی خەڵاتی رەمەزان بۆ گۆرانکاری و داهێنان

نووسینی

مامۆستا سیروان شێروانی

پێشنوێژو وتارخوێنی مزگەوتی خدر سوارە

## سوپاسگوزاریم بۆ:

* دوای سوپاسی بێ ئەندازەو بێ سنوورم بۆ خودای تـاك و تـەنیا، ئینجـا سوپاسـم بـۆ خەڵكانە وەك پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرموێ: ((من لم یشکر الناس لم یشکرالله)) {تیرمیزی گێڕاویەتیەوە}

* زۆربـەرێزو دڵـسۆزو ئـایین پـەروەر مامۆسـتا (إدریـس موحەمـەد) بۆهەڵـە چـنی و پێداچوونەوەی

*خاتوونی سەنگین رێزدار دایکی (رێنما) و (عبدالرحمن)، خودای گەورە پایەداری بکات لە دونیاودوارۆژ.

* برایانی گەنج و لاوی بەرێز و خۆشەویست کاك (یونس جمعە) و کاك (هـێمن أیـوب ) دەکەم بۆ هاوکاری کردنم

* هەر کەسێك هەڵەیەك یا سەرنج و تێبینی و ڕەخنەیەکی بنیات نـەرو دڵـسۆزانەم بـۆ بگێڕێتەوەو، پێم ڕابگەیەنێت.

## پێشکەش بێت بە:

* بە روحی ئەو دایك و باوکەی کە هەرگیز نـاتوانم چـاکەیان بدەمـەوە، بـەو هیوایـەی خۆمو هەموو کارەکانم بە تایبەت ئەو بەرهەمە ببێتە خێرێکی نەبڕاوە بۆ بەندەو ئەوانیش.

* هەر مامۆستایەکم کە لەژیانمدا فێری تاکە پیتێکیـان کـردبم، بەتایبـەت مامۆسـتای باوك ((عبدالقادر رسول البحرکی)) خودای گەورە شیفای بدات و پایەداری بکات لـە دونیـاو دوارۆژ.

* هەموو ئەو کەس و دڵسۆزانەی کە هۆگری ڕەمە زانن و مانگی ڕەمەزان بەشاخەڵاتو دیاری خودای گەورە دەزانن.

* ئەو کەسانەی کە بەردەوام و هەمیشە لەپێشڕەوی و گۆڕانکاری دان

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خودای تاك و تەنیا، سڵاوو ڕەحمەتی خودا بۆ سەر پێغەمبەری کۆتا، هەم لەسەر یاوەرانی تارۆژی دوا.

ئەگەر سەرنجی ژیاننامەی پێغەمبەری خوداو(ﷺ) هاوەڵان و پیاوچاکانی پێشوو بدەین، بۆمان دەردەکەوێت کە مانگی ڕەمەزان وەرزێکی چەند گرنگ و گەورەیە لەژیانی مرۆڤ بۆچاندنی کرداری چاك و باشەو، وەچاکترین پلیکانەیە بۆگەیشتن بەکاروانانی ڕێگای خودای گەورە.

لەڕەمەزانی ساڵی ڕابردوو کتێبێکمان کردە خەڵاتی ڕەمەزان دۆستان و ڕۆژەوانان بەناوی (ڕەمەزان وێستگەی بەخۆدا چوونەوە) ئەم ساڵیش لەسەر داوای چەند موسڵمانێك کەشتێك پێشکەش بکەم سەبارەت بەمانگی ڕەمەزان، هەر چەندە سەرقاڵی نووسینی تریش بووم، بەڵام لەبەر دوو هۆ نەمتوانی ئەم داواکاریە پشت گوێ بخەم:

یەکەم: زانیم نووسین دەربارەی ڕەمەزان بەرەکەتێکی تایبەتی هەیە، شایستەیەی هەموو شتێکی لەپێناو بەخت بکرێت و وازی بهێندرێت، خودای گەورەش بەچەندانە تۆڵەت بۆ دەکاتەوە .

دووەم: کاتێ بیرم کردەوەو ووردبوومەوە، لە بارودۆخی ئەو سەردەمەی ئێستای موسڵمانان بینیم کە خوداپەرستی و پەرستشەکانی زۆربەی خەڵکان بەشی زۆری هەر ڕواڵەتی و سەر زارەکی یە و تێکەڵ بەناخ و دڵ و دەروونیان نەبووەو زۆرکەم کاریگەری تێ کردوون بۆیە بەباشم زانی ئەم بەرهەمەی ڕەمەزانی ئەم ساڵ بەناوی ((٣٠) سی خەڵاتی ڕەمەزان بۆ گۆڕانکاری و داهێنان) بێت بەو ئومێدەی ببێتە شۆڕشێکی گۆڕانکاری بەسەر دڵ و دەروونی هەموو تاکێك و کۆمەڵگەی موسڵمان بەگشتی.

بۆیە هەر لە زووەوە خودای گەورە ئەو نیعمەت و چاکەی لەگەڵمدا کردووە، بیرم دێت هەر لەتەمەنی سەرەتای لاویەتیم بوو، لەو ڕەمەزانەی کەپۆلی پێنجەمی سەرەتایی بووم ڕۆژی پێشی ڕەمەزان بوو، بەیانی یەکەم ڕۆژی ڕەمەزان بوو، ڕەمەزانەکانی لەوەو پێش بەڕۆژوو

دەبووم بەڵام نەمدەزانی نوێژ بکەم، بۆیە زۆر هەوڵمدا لەگەڵ هاوڕێیەکی قوتابخانەم کە فێری نوێژکردنم بکات، بەڵام دوایی کەهاتمەوە ماڵ پێش نوێژی (عیشا) برایەکم نوێژێکی بەدەنگی لەپێش من کردوو منیش لەدوای ئەو ئەوەی ئەو دەی ووت دووبارەم دەکردەوە تەنها بەیەکجار فێربووم - خودا پاداشتی بداتەوە-، هەر دوای ئەو نوێژ هەر لەگەڵ ئەودا بەیەکەوە چووینە مزگەوت و نوێژی (عیشا) و (تەراویح)م بەکۆمەڵ ئەنجامدا، دواییش لەڕەمەزانەکانی تری دواییدا بەر لەهاتنی هەر ڕەمەزانێکدا بەچەند هەفتەیەك بەشێوەو شێوازێکی تایبەت بەرنامەمان دادەڕشت بۆ پێشوازی کردن و بەسەربردنی ئەو ڕەمەزانەپیرۆزە تا لەیەکێ لەڕەمەزانەکاندا لەماوەی مانگی ڕەمەزانێك سێ خولی زانستی شەرعیمان بەڕێوە دەبرد، بەیانیان خولێك و دوای نوێژی (عەسر)انیش دوو خوو خول بەیەکجاری بەڕێوە دەچوو، بۆیە بەڕاستی ئەو ڕۆژگارە پڕ لەخێرو بەرەکەتانەم هەرگیز لەیاد ناچێتەوەو لەو ڕۆژانە فێربووم کە مانگی ڕەمەزان وەرزێکە زۆر بەپیت و فەڕو بەرەکەتە بۆ ئەوەی بیەوێت چاکەی تێدا بکات، بەڕاستی کاتێی بەسوودو بەخێرو پیرۆزە، بۆیە ئەوەی تەمەنی زێڕینی بەفیڕۆداوەو لەدەستی چووە لەو مانگ و وەرزە پڕ لەخێرە دەتوانێت قەرەبووی بکاتەوە، ئەوەی لەکاروانی خواناسان بەدواکەوتووە دەتوانێت لەو مانگە زۆر بەئاسانی بگات بەکاروان، ئەوەی ڕەنج بەخەسارو بارقورس و گرانە دەتوانێت لەم وەرزەدا باری گرانی لەکۆڵ خۆی بکاتەوەو بارو کۆڵێکی وەك پەمۆ هەڵبگرێت کەلەدونیادا بارستایی هەیەو بەڵام سەنگی نیە، بەڵام بۆ دواڕۆژ سەنگی هەیەو بارستایی نیە.

ئەوەی لەم دونیایەدا تائێستا نەی زانیوە بژیت بەهۆی بێ بەرنامەیی و سەرگەردانی بالەم مانگەدا خۆی فێری ژیان بکات و بەرنامەی خودای گەورە بکات بەرێنیشاندەری خۆی.

ئەوەی تائێستا ڕێگا نزیکەکانی لەخۆی دوور خستۆتەوە با لەم ڕەمەزانەوە ڕێگادوورەکان لەخۆی نزیك بکاتەوە.

لەقوتابخانەی ڕۆژوو خودای گەورە بناسە.

لەقوتابخانەی ڕۆژوو فێری خۆشەویستی ڕاستەقینە خۆشەویست بە(ﷺ).

لەقوتابخانەی ڕۆژوو بزانە بۆچی هاتیە دونیاو، ئەرکت چی یە لەم دونیایەو، بەرەو کوێ دەگەڕێیتەوە.

لەقوتابخانەی ڕۆژوو ریزی گەنجایەتی خۆت بدۆزەرەوەو.

لەقوتابخانەی ڕۆژوو شارەزای ئایینی خۆت بە.

لەقوتابخانەی ڕۆژوو کەسایەتی و شارەزایی خۆت هەڵبسەنگێنە .

لەقوتابخانەی ڕۆژوو لەبەخشش و بەهرەمەندیەکانی ڕەمەزان بەهرەمەند و سوودمەند بە.

لەقوتابخانەی ڕۆژوو ریزی قورئان بزانەو ریزی خۆت بدۆزەوە لەقورئانی پیرۆز.

لەزانکۆی مانگی پڕلەشکۆو ریزەوە خۆت بگۆڕە لەخراپەوە بۆچاکە وچاکەکاری.

لەم زانکۆ شاهانەیەو هەستەکانت ببزوێنە جیاوازبە لەگەڵ ڕەمەزانەکانی پێشوو.

لەم زانکۆشکۆمەندەدا پلانت بۆ داهاتوو دابنێ.

بڕوانامەی ئەم زانکۆیە با ڕزگارت بکات لەئاگری دۆزەخ و بەرەو بەهەشتت ببات.

لەکۆتاییدا: خوشك و برایانی گەنج ولاوان ئەوینداراني مانگی خێرو ڕحمەت و شکۆمەندی هەرچی چاك و باشە لەلایەن خودای گەورەی میهرەبانەوەیە، هەرچی کەم و کورتی خراپیە لەبەندەی گوناهبارەوەیە، هەمیشەو هەردەم گومانی باشم هەیە بەئێوەی خوشك و برایانی خوێنەری دڵسۆزو بۆیە وەك پێشەواو گەورەمان (عومەری کوڕی خەتتاب) دەڵێم: ((رحم الله امرءا أهدى إليّ عيوبي))

(ڕەحمەتی خودا لەو کەسەی کە هەڵەو کەم و کورتیەکانم بە دیاری و خەڵات بۆ دەگێڕیتەوە)

**بەندەی دڵسۆزتان**

**سیروان شێروانی**

هەینی (١٠/ڕەجەبی/١٤٣٣) بەرامبەر (٢٠١٢/٦/١)

٠٧٥٠٤٤٦٧١٣٠

# خەلاتی یەکەم

## وا هات مانگی میهرەبانی

پیاوچاکێك وا ڕیك دەکەوێت شەوێك لەگەڵ کۆمەڵە گەنج و لاوێك بەسەر ببات، کە ئەو لاوانە تەنها خەریکی ڕابوارن و گەمەو گاڵتەجاڕی بوون، دەقیان بەم شتانە گرتبوو..بێ سەرو.. سەرگەردان..بۆیە ئەم مامۆستا بەڕێزە پرسیاری لێیان کرد: ئەی گەنجینە ئەوە خەریکی چین؟ هەموو بەیەك دەنگ وەڵامیان داوەو ووتیان: کاتەکانمان دەکوژین .. وەخت بەسەردەبەین تا کاتی بەربانگ دادێت . ئەو پیاوە بەتەمەنە دڵسۆزە پێیانی ووت: بەڵام گەنجەکان دەزانن ئەو مانگە مانگی ڕەمەزانە.. دەزانن ڕەمەزان واتە چی؟ دەزانن ئەو مانگە پیرۆزە چی تیایە؟ لەو مانگە پیرۆزەدا خودای گەورە ڕووی میهرەبانی خۆی لە بەندەکانی دەکاتو..حۆریەکانی بەهەشتیش بەپەرۆشی گەیشتنن بە ئێوەو .. بەهەشتی پان و بەرینی خودای گەورەش خۆی دەرازێننتەوە بۆ ئیوە.. ئێوەش کات و ساتەکانی ئەو مانگە پڕ لە خێرو بەرەکەت و شکۆمەندیە دەکوژن لەگەڵ ئەوەی لە چاکەو خێرو ڕەحمەت هیچ زەرەرو زیانێکی بۆ ئێوە نیەو، دوژمنی ئێوەش نیە بەڵکو خۆشەویستی و میهرەبانە لەگەڵ ئێوە چونکە دەستتان دەگرێت بۆ بەهەشت و ڕزگارتان دەکات لە ئاگر..ووتیان: بەڵام چی بکەین مامۆستای بەڕێز: ڕۆژگارەکە درێژەو گەرمە.. ئەو پیاوە خودا ناسە ووتی: بڕوا دەکەن سوێند بەخوا.. ئەگەر کات بە پارەو پوول و سامان بکڕدرابا هەرچی مولك و سامانم هەیە پێم بدابا لێی پەشیمان نەدەبووم، گەنج و لاوەکانیش بە سەرسوڕمانیەوە ووتیان: ئینجا مامۆستا کوا کات لە کوێ و چۆن دەکڕدرێت..؟! ئەویش لەوەڵامیاندا ووتی: لەو کەسە بێ ئیش و کارو دەست بەتاڵانەی هاوشێوەی ئێوە).

موسڵمانانی ئاین پەروەر: ئەوە بەسەرهات و چیرۆکی قوتابی و کەسێکی تێگەیشتوو شارەزایە لە دینی خودای گەورەو، خەمخۆرێکی ئیسلامە، لەگەڵ لاوانێك کە نازانن بۆچی دروست کراون و! بۆچی دەژین و بۆچی بە ڕۆژوو دەبن! دوا ڕۆژوو گەڕانەوەیان بۆ کوێ یە!

کەوابوو بۆ ئەوەی ئێمەش بێ ئاگاو نەشارەزا نەبین، بەرچاو ڕوون و شارەزابین لە گەورەیی ئەو مانگ و وەرزە پڕ لە ڕەحمەت و شکۆداریە، با بزانین سەروەرمان نوری چاومان پێغەمبەری پێشەوا(ﷺ) چۆن پێشوازی لەو مانگە پیرۆزە کردووەو، باسی فەزل و گەورەیی ئەمانگە پڕ خێرو بەرەکەتەی کردووە، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) هەر کاتێ بگەیشتبا بە مانگی ڕەجەب لە خودای گەورە دەپاڕایەوەو ئەو دوعایەی دەکردو دەی فەرموو: (ئەی پەروەردگارا مانگی رەجەب و شەعبانمان لێ پیرۆزو بەرەکەت دار بکەو، بمان گەینەوە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز) {تەبەرانی گێڕاویەتیەوە} وە لە ڕۆژەکانی کۆتایی مانگی شەعباندا پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) موسڵمانانی لە مزگەوتە پیرۆزەکەی خۆی کۆ دەکردەوەو مژگێنی نزیکبوونەوەی بەو موسڵمانانە دەدا کە عەودالّ و بەپەرۆش بوون بۆ ئەو مانگە پیرۆزو بە سەنگەو ڕووی تێ دەکردن و دەی فەرموو: (وا هاتەوە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، کە خودای گەورە بە ڕۆژوو بوونی تێدا فەرزو واجب کردووە، وە دەرگاکانی ئاسمان تێدا دەکرێتەوەو! دەرگاکانی دۆزەخی تێدا دادەخرێت و! وە شەیتانەکانی تێدا کۆت و زنجیر دەکرێت! شەوێکی تێدایە کە خێرو چاکەو عیبادەت کردن لەو شەوەدا خێری هەزار مانگی هەیە! بەڕاستی زەرەر مەندو دۆڕاوو بێ بەش ئەو کەسەیە کە خۆی لەو خێرو پاداشتە بێ بەش بکات) {نەسائی و بەیهەقی لە سەحیحی تەرغیبدا گێڕاویەتیانەوە ژمارە(٩٨٥)}

پیاوچاکان و خواناسانی پێشوش (ڕەحمەتی خودایان لێ بێت)چاویان لە پێغەمبەری خودا کردووە (ﷺ) بۆیە ئەوانیش خۆیان ئامادە دەکرد بەر لە هاتنی ئەو مانگە بەڕێزە وەك موعوللای کوڕی فەزل دەفەرمووێت: (پیاو چاکانی پێشوو شەش بەر لە هاتنی مانگی ڕەمەزان لە خودا دەپاڕانەوە کە بەو مانگە پیرۆزەیان شاد بکاتەوە، شەش مانگیش دوای ڕەمەزان لە خودای گەورە دەپاڕانەوە کە تاعەت و عیبادەتەکانیان لێ وەبگرێت و بە ڕوویاندا نەداتەوە).

برای گەورەو خۆشەویستم: دە لەگەڵمبە با بەیەكەوە گەشتێكی خێرا بكەین بەناو گـوڵ و گولزارەكانی قورئانی پیرۆزو فەرموودە پاك و بێگەردەكانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) سـەبارەت بە گەورەیی و شكۆمەندی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز:

١ـ تاكە مانگێكە لەناو هەموو مانگەكان كەناوی هاتووە لە قورئـانی پـیرۆزو، ڕێـزدارو گـەورە بـووە بـە دابـەزینی قورئـانی تێیـدا: ﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ﴾ {سورەتی البقرة: ئایەتی ١٨٥}

٢ ـ تایبەتمەندە بە عیبادەتێكی تایبەت، كە گەورەترین عیبادەتە، ئەویش كە عیبادەتی ڕۆژووە.

٣ـ ئەو مانگە پیرۆزە سێ خـەڵات و دیـاری زۆر گـەورەی خـودای گـەورەی تێدایـە كـە ئەمانەن: سەرەتاكەی ڕەحمەتە، ناوەڕاستەكەی لێخۆشبوونی خودای میهرەبانە، كۆتاییەكەشی ئازابوونە لە ئاگری دۆزەخ.

٤ ـ هەر سێ بەخششی زۆر گـەورەی خـودای گـەورەی لـە خـۆ گرتـووە كـە ئەمانـەن: دەرگاكانی بەهەشتی تێدا دەكرێتەوە، دەرگاكانی دۆزەخی تێـدا دادەخرێـت، شـەیتانەكانیش تێیدا زنجیر دەكرێن.

٥ ـ گەورەترین سفرەی ڕەحمەتی خودای گەورە لەو مانگەدایـە: كـە دەتـوانی قـەرەبووی هەموو كەم و كورتی و كەمتەرخەمیەكانی ژیانی خۆتی تێدا بكەیتەوە، ئەویش تەنها لە یەك تاكە شەو، كە شەوی قەدرە، خێری هەزار مانگی هەیە، كە دەكاتە (٨٣) هەشتاو سـێ سـاڵ ﴿ لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ ﴾ {سورەتی القدر: ئایەتی٣}

٦ ـ مانگی بەرز كردنەوەی سەرمایەو دەسـكەوتەكانە، وەرزی بەدەسـتهێنانی چـاكترین بەرهەمە، بە بەرەكەتدار كردنی كردارەكان لەلایەن خودای خاوەن بەخشش و بـەزەیی ئـەویش بەوەی: هەر كەسێك یەك فەرزو واجب لەو مانگەدا جێ بەجێ بكات خێری حەفتا فـەرزی بـۆ دەنوسرێت، ئەوەی سوونەتێك لەو مانگەدا جێ بەجێ بكات خێری فەرزێكی بۆ دەنوسرێت.

٧ ـ لـە ڕەمـەزانی ڕابـوردووەو هەرچـی گونـاهو تاوانێـك کرابێـت، جگـە لـە گوناهـە گەورەکان، مـانگی ڕەمـەزان هـەمووی ڕەش دەکاتـەوەو دەسـڕێتەوە، وەك لـە فـەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە.

٨ ـ ئەو مانگ کلیل و دەرگایەکی بەهەشتە بەناوی دەرگای (ڕەیـیـان) واتـە: پـاراوان و تێرئاوانی ڕۆژی دوایی، وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرموویێت: (بەهەشت دەرگایەکی هەیە پێی دەڵێن (ڕەیـیان) لە ڕۆژی دوایی ڕۆژووەوانان لەو دەرگایە دەچنە بەهەشـت، جگـە لـەوان کەسی تری لێ ناچێتە بەهەشت) {لەسەحیحی جامیعدا هاتووە ژمارە(٢١٢١)}

٩ ـ ڕەمەزان باشترین و چاکترین هەلە بۆ بەدەست هێنانی بەرزترین پلەوپایەو ناونیـشان لای خودای میهرەبان، پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری ئەکرەم (ﷺ) ووتی ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەگەر من شایەدی بە تاك و تـەنیایی خـودای گـەورەو، بەپێغەمبەرایـەتی تـۆو، هەرپێنج نوێژەکەم بکەم و، زەکات بدەم و، مانگی ڕەمەزانیش بە ڕۆژوو ببم و شەونوێژی تیـا بکەم، خـودای گـەورە چ پلـەو پایـەکم پـێ دەدات و، لـە گـەڵ کـێ دەبم لـە ڕۆژی دوایـی؟ پێغەمبەری خودا فەرمووی: تۆ لەگەڵ ڕاستگۆو شەهیدەکاندا دەبـی) {بـەزارو ئـیبن خوزەیـمەو ئـیبن حیبان گێڕاویەتیانەوە}

١٠ـ مانگی ڕەمەزان متمانە بەخش و دڵنیاکەرەوەیە لە چوونە ناو ئاگری دۆزەخ.

١١ـ مانگی ڕەمەزان تکاکارە بۆ ئەوانەی بەڕۆژوو دەبـن و ڕێـزی دەگـرن، پێغەمبـەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرمووێ : (ڕۆژوو قورئانی پیرۆز تکاکارن، ڕۆژوو دەچێتە بـەر بارەگـای خودای گەورەو دەڵێت: ئەی پەروەردگارا مـن خـواردن و خواردنـەوەم بـە ڕۆژ لێـی قەدەغـە کردبوو، ئەی خودایە بە تکاکەم بۆی لێ وەربگرە) {لە سەحیحی جامیعدا هاتووە ژمارە(٣٨٨٢)}

١٢ـ مانگی سەرکەوتنە بەسەر هەواو نەفس و شەیتان و دوژمنانی خواو دینی ئیـسلام، مانگی ئازاد بوونی وڵاتانی داگیرکراوو ژێر دەستە بووە.

کەوابوو ئەوە سفرەی ڕاخراوی خودای گەورەو میهرەبانە، ئـەوەی پێویـستە لەسـەر تـۆی موسڵمان ئەوەیە: ئەگەر بەندەی ڕاستەقینەی خودای گەورەی ئەوە کـەرەم و ڕەحمـەتی خـودای

گەورەیە، گوناهو تاوانەکانی خۆت لە ناو ڕەحمەتە بێ سنورەکەی بشۆوە، خۆت بۆندارو ڕێـزدار بکە بە لێخۆشبوونە فراوانەکەی، دواییش هـەوڵ بـدە بـۆ بەدەسـت هێنـانی پلەوپایـە هـەرە بەرزەکانی بەهەشتی خودای گەورە.

## * چۆن پێشوازی لەومانگە پڕ لەخێرو پیرۆزە:

١ـ تەوبەیەکی تەواو بکەین، پەشیمانی دەرببڕین لەهەموو گوناهە تاوانەکانمان.

٢ـ دڵخۆش و شادومان و کامەران بین بەهاتنی، چونکە ئەومانگە ڕەحمـەت و بەخشـشی خودای گەورەیە، خودای گەورەش داوامان لێ دەکات کـەدڵخۆش و کامـەران بـین بەڕەحمـەت ومیهرەبـانی ئـەو وەك دەفـەرمووێ:﴿ قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴾ {سورەتی یونس: ئایەتی٥٨}

٣ـ دانانی بەرنامەیەکی تۆکمەو تێرو تەسەل بۆ هەموو ڕۆژەکانی ئەو مانگە بەگشتی.

٤ـ بڕیاردانی ئەنجامدانی نوێژی تەراویح.

٥ـ ماڵبەخشین ویارمەتی دانی هەژارو نەداران، لەزەکات و سەرفیترەو هەرجۆرە خێرێکـی تر.

٦ـ بەرنامە دانان بۆخوێندنی قورئان وچەند خەتمێك کردن.

٧ـ مانەوە لەمزگەوت بەنیەت ومەبەستی (ئیعتیکاف).

٨ـ ئەنجامدانی سیلەی ڕەحم و بەسەرکردنەوەی خزم و کەسوکارو دۆستان.

٩ـ زیادکردنی زانست و زانیاری بەبەشداری کردن لەکۆڕو ووتارەکـان و وانـەی شـەرعی و کیتاب خوێندنەوە.

١٠ـ بەرنامەیەکی تایبەت بۆ زیکرکردن زیکری بەیانیان و ئێـواران و هـەموو جۆرەکـانی تری زیکر

براو خوشکی سەنگین: هـەر خـالێکیش لـەو خالانـەی سـەرەوە بەتایبـەت لەبابەتـەکانی داهـاتوو بەدارشـتنی بەرنامەیـەکی تایبـەت دەخەینـە بەردەسـتی بـەرێزتان بـەهیوای جـێ بەجێکردن و سوودمەندبون لێی.

**بڕیاری گۆڕانکاری بدە:**

**بیر لەڕەمەزانی ڕابردوو بکەوە:**

چەند کاری باش و چاکت تێیدا ئەنجامدا، لەو ڕەمەزانەدا زۆرتـرو باشـتریان بکـە، چـەند کەمتەر خەم بوویت تێیدا، لەچی پەشیمانی لە ڕەمەزانی ئەو سالاقەرەبووی بکەوە.

**لە کۆتاییشدا شاعیری خواناس دەفەرمووی:**

مانگی ڕۆژوو، ڕەمـەزان هات میـوانێـکی زۆر بەکـەلکە
ئەو دەرفەتە لەدەست مەدەن بە هەل بزانن ئەی خەلکە
لەسـەرتا پـێ بالای بەرزی ئەو میـوانە چاکـەو خێرە
ڕێزی لەسەر چاوان دانـێن هـەر کاتێ گـەیشتە ئـێرە
لە پێـشوازی ڕابـوەسـتن هـەتا ماون هـەموو جارێ
لە پـێناوی ئێـوەی بەرێزلە خـواوە هاتوتە خـودارێ
لە کـۆتاییدا هـەر کەسێ نەگـرێ ڕێـزی ئـەو میـوانە
هـەر بە ڕووخسـار ئادەمییە هاورێ و هاوبیری حەیوانە

**((سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك))**

# خەلاتی دووەم

## برووسكە خێراكان ئاسمانەكان دەبڕن

ئەو بەسەر هات و چیرۆكەی ئەم ووتارەمان چیرۆك و بەسەر هاتی پێغەمبەرێك یا هاوەڵێك یا پیاو چاكێكی پێشینە نیە، بەڵكو ڕووداوێكی ڕاستەقینەی ئەم سەردەمەیە، لە شاری سولەیمانی ڕووی داوەو، مامۆستایەكی بەڕێزی ئەم شارە، خۆی شایەد حاڵی ئەم بەسەرهاتەیە، بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرمووێ:

كچێكی لە خواترس و دەسگرتوو بەدین، كەسێكی خەمخۆر بەرامبەر بە ئیسلام و تێگەیشتوو شارەزا لە دینی خودا، ئەم ئافرەتە دوای ئەوەی چەندین ساڵ كە بەهاری تەمەنی خۆی خەرج كرد لە ڕێی مزگەوت و دینداری، لەناكاو كارەساتێكی زۆر سەخت ڕووی تێ دەكات كارەساتەكەش نەوەك كارەساتێكی گیانی و ماڵی بێت، بەڵكو كارەستێكە ڕوو لە دینەكەی دەكات، ئەو كچە خواناسە دیندارە ڕۆژێك لەناكاو باوكی هەواڵێكی پێ دەدات بەڵام ئەم هەواڵە هەموو گیانی هێنا هەژان! دەبێ چ هەواڵێك بێت ئەوەندە كاریگەرو ناخۆش بێت! هەواڵی بە شوودانی بەڵام شوو كردن بە كێ؟! بە برازای باوكەكەی! كە كەسێكە لە هەموو ڕوویەكەوە پێچەوانەی بیرو بۆچوون و هەڵسوكەوتی ئەم كچە خودا ناسەیە، كەسێكی خوانەناس نەوەك خودانەناسە، بەڵكو هەر بڕوای بە بوونی خودانیە! كەسێكی نوێژ نەكەرو ئارەق خۆر، ژیان لای ئەو خواردن و خواردنەوەو ڕۆژ بەسەربردنەو بەس!

دەمزانی قسە كردن و پاڕانەوە هیچ سوودێكی نیە لەگەڵ ئەو باوكە ویژدانەم، بەڵام دانم بە خۆدا گرت و پێم لەجەرگی خۆم نا، ووتم: بابە گیان خۆت زۆر چاك من دەناسی، شارەزای ئەو برازایەی خۆشتی، زۆر چاك دەزانی هەموو ڕوویەكەوە لەیەك جیاین و لەگەڵ یەك ناگونجێین، كاتێ باوكم ئەو چەند قسەی لێم بیست، وەك هەورە تریشقەو، فیشەكە شێتە بەڕوومدا تەقیەوەو هەرچی قسەی ناشیرین و ناشیاو هەیە پێی ووتم وە چەندین تۆمەتی نا ڕاست و نا دروستی دا پاڵم، تا گەیشتە ئەوەی هەڕەشەی كوشتن.

ئیتر زانیم هیچ ڕێگاو چارەسەرێکم نیە جگە لە ڕازی بوون و، هاتنە ژێر ئەو بارەی کە تێی کەوتووم، بۆیە بە زۆری زۆرداری بە دڵ و هەناسەیەکی ساردو سڕەوە بەر لە هاتنی مانگی ڕەمەزان مارەم لەو ئامۆزایەم برا، دواییش بە دوو سێ هەفتە پێش هاتنی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز منی گواستەوە، بەڵام کاتێ لە شەوی یەکەمی بوکێنی دا ئینزاری یەکەمی دا ووتی: ئەوە پێت دەڵێم بۆ خۆت نوێژ کەیفی خۆتە، بەڵام بە هیچ نامەوێت بت بینم لە سەر بەرماڵ، نامەوێت لەبەر چاوی من نوێژ بکەی! ئەوەی ووتی جێ بە جێم کرد، کاتێ یەکەم ڕۆژی ڕەمەزان هات ئینزاری دووەمیشی دەرکردو ووتی: ئەوە پێت دەڵێم بۆ خۆت بە ڕۆژوو دەبی ئارەزووی خۆتە، بەڵام بەهیچ شێوەیەك پارشێو خواردن نیەو، خەو لەمن نازڕێنیت بە دەنگ و دەنگی نان و چێشت ئامادەکردن، ئەو ئافرەتە دیندارە بیست و حەوت ڕۆژی ڕەمەزانی بەم شێوە ڕابوارد جگە لە سوکایەتی پێ کردن و ڕێز لێ نەنان، چەندین ئازار ئەشکەنجەی دەروونی، بەڵام ئەو ئافرەتە متمانەو بڕوایەکی بە تینی بە خودای گەورە هەیە، دەشزانی کە مافی پیاو چەند گەورەیە لە ئیسلام بۆیە ئەوپەڕی ڕێزی لێ دەناو تا بەرەشتو ئاکارەکانی کاری تێ بکات و بیهێنێتەوە سەر ڕاستە شەقام.

دوای ئەو ماوەیە لە شەوی بیست و حەوتی ڕەمەزان شەوی (قەدری) پیرۆز ئەو ئافرەتە بەرێزە لە دڵ و دەروونـدا وەك مەنجەڵ کەکوڵا، بیرەوەریەکانی ساڵانی پێشوو کە لە مزگەوتەکاندا خەریکی نوێژو قورئان خوێندن و خزمەتی موسڵمانان بوو، بەڵام ئێستا لە ناو جێگاکەی ناتوانێت هیچ شتێك بکات، بۆیە بە پەنهانی تەنها فرمێسکی هەڵدەڕشت کاتێ کوێی لە دەنگی مزگەوتەکان دەبوو بە دەنگی قورئان و نوێژو ووتار بەرز دەبوەوە، تا کاتی پارشێو بەم شێوە بوو، کە پیرۆزترین کاتی پیرۆزترین شەوە، لەو کاتەدا ئەو خۆی پێ ناگیرێتو لە ژێر جێگاکەی بە ئەسپایی دێتە دەر، دەسنوێژێك دەشوات و چەند ڕکاتە نوێژێك دەکات، ئینجا سەری دەخاتە سەجدە بۆ دوعا کردن لە پیاوەکەی! نەخێر دوعا کردن بۆی، بۆیە بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە دەڵێت: ئەی پەروەردگارا ئەی خوایە خۆت فەرمووتە کە دڵی بەندەکانم لە نێوان دوو پەنجەیە لە پەنجەکانی چۆنم بوێت وای وەر دەگێڕم، ئەی خودایە هیچ دوعایەکی خراپ لەو پیاوەم ناکەم، تەنها دەڵێم دڵی وەرگێڕە لە خراپەوە بۆ چاکە.

هەر ئەوەندەم کردو چوومەوە نا جێگاکەی خۆم، کاتێ بەیانی داهات وەکو ڕۆژان نانم بـۆ ئامادە کرد بەڵام نانی نەخواردو بەبێ نان ڕۆیشت زۆر ترسام، ووتم: داخی ئەو شەوەی لە دڵەو لێم تۆراوە، بۆ نیوەڕو چێشتم ئامادە بەڵام نەهاتەوە بۆ نان خواردن ترسەکەم زۆر زیـاتر بـوو، نەم زانی ئەو ڕۆژە چۆن بووە ئێوارەو چەندین شتم بەبیر دادەهات، تەنها ئەوەی بینیم بە بـیرم دانەهات، کاتێ پێش بەربانگ بینیم پیاوەکەم هاتەوە بەڵام چۆن هاتنەوەیەك! دوو شـتم لێـی بینی یەکێکیان زۆر ترسناك و یەکێکی زۆر سەیر ئـەوەی کـە زۆر سـامناك بـوو دەم و ڕەش ببوو زۆر بێ تاقەت بوو، وە ئەوەی زۆر سەیر بوو هەر دوو دەسـتی پـڕ بـوو لـە شـتومەك و عەللاگە، کە ئەمە یەکەمجار بوو بەم شێوە بیبینم، هەروەك جاران چوومە پێشوازی و بەرداغە ئاوێکم بۆی برد. ووتی: ناخۆمەوە. زۆر ترسام هەر چۆنێك بوو تەکانم دا بە خۆم پرسیار لێـی کرد: پیاوەکە خۆ نەخۆش نی؟ ووتی: بەس پێم بڵێ ئەو شەوە تۆ چ سیحرو جادوێکت لە مـن کردووە، (واللە) ئەو شەو تا بەیانی دۆزەخیان نیشان داوم و پێیان ووتوم تا کەی ئـەم ئافرەتـە ئازار دەدەی، تا کەی خودا ناناسی؟!

بۆیە ئافرەت گەردەنم ئازادکەو ئەمڕۆ یەکەم ڕۆژە لە ژیانم مە بە ڕۆژوو بـووم، ئێـستاش وەرە تۆ نوێژی مەغریب بکە منیش لە تەك تۆ ڕادەوەستم فێری نوێژم بکە.

کاتێ ئەم ئافرەتە ئەمەی بیست زانـی خـودای گـەورە بـە هانـای هـاتووەو، دوعاکـەی گیرابووە، بۆیە لە خۆشیان فرمێسك بە هەردوو چاوەکانیدا دەهاتە خوار، بۆ یەکەمجار لـە نـاو ئەم خێزانە لە سەر یەك سفرە بەربەربانگ کرایەوە، ئەو مامۆستایەی کە ئەو بەسـەر هاتـەی تەنها لای ئەوە دەفەرمووێ: ئەمە دووەمین ڕەمەزانە ئەو ژن و پیاوە لـە مزگەوتەکـەی ئێمـە نوێژ دەکەن و بەختەوەر ترین خێزانن و منداڵێکی چاو گەشیشیان هەیە .

ئـەو بەسـەرهات و چـیرۆکە ڕووداوێکـی ڕاسـتەقینەیە، گـەورەیی کاریگـەری دوعـاو پاڕانەوەمان بۆ بەدەر دەخات و، کە دوعاو ڕۆژوو دوو عیبـادەتی زۆر گـەورەو گـرنگن، هـەر بۆیەش خودای گەورەو میهرەبان دوا بەدوای ئایەتی ڕۆژوو ڕاستەوخۆ باسـی دوعـاو پاڕانـەوە دەکات وەك دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا

دَعَانِۖ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾ {سووڕەتی البقرە: ئایەتی (١٨٦)}
واتە:(ئەی موحەممەد(ﷺ) ئەگەر بەندەکانم پرسیارت لێ بکەن دەربارەم، ئەوە من نزیکم لێیانەوە، بەهاناو هاواری دوعا گۆیان دەچم هەر کاتێك لێم بپاڕێنەوەو نزا بکەن، دەبا ئەوانیش بەدەم بانگەوازی منەوە بێن و باوەڕی دامەزراو بەمن بهێنن، بۆ ئەوەی ڕێگای هۆشیاری و ئاگایی بگرنە بەر (بۆ بەدەستهێنانی سەربەرزی و سەرفرازی هەردوو جیهان))

بەڕاستی پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) بە جوان ترین شێوە باسی پاڕانەوەی کردووە کە چەکی ئیمانداری داناوە وەك دەفەرمووێ: ((الدعاء سلاح المؤمن)).

**ئایا دەزانی:**

* ئەوەی لە خودای گەورە نەپاڕێتەوەو، داوای لێ نەکات خودای گەورە لێی تووڕە دەبێت، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەری نازدار هاتووە. {سەیری سەحیحی جامیع ژمارە(٢٤١٨)}

* خودای گەورە بە شەرم و شکۆ بەڕیزو بەخشندەیە، شەرم دەکات کاتێ کەسێك دەستی بۆ بەرز بکاتەوەو داوای لێ بکات، دەستەکانی بەندەکەی بە بەتاڵی و نائومێدی بگێڕێتەوە. {سەیری سەحیحی جامیع ژمارە: (٨١٣٦) بکە}

* بەڕێزترین و گەورەترین عیبادەت و پەرستشە، هیچ کردارو عیبادەتێك بەڕێزترو گەورەتر نیە لای خودای گەورە لە عیبادەتی پاڕانەوە. {سەیری سەحیحی جامیع ژمارە: (٥٣٩٢) بکە}

* ئەوەی سستی و کەمتەرخەمی بکات لەو عیبادەتە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە کەسێکی بێ دەسەڵات و تەمبەڵی داناوە. {سەیری سەحیحی جامیع ژمارە: (١٠٤٤) بکە}

* ئەوەی دوو دڵ بێت و متمانەی تەواوی نەبێت بە گیرابوونی دوعاکانی، نزاو پاڕانەوەکانی لە دڵەوە نەبێت، لێی وەرناگیرێت. {سەیری سەحیحی جامیع ژمارە: (٢٤٥) بکە}

* دوعاو پاڕانەوە چەکە زۆر بە لێزانی و کارامەیی بە کاری بینە، لەدژی موسڵمانان بەکاری مەهێنە، بۆیە دوعا لە خۆت و ماڵ و منداڵت مەکە، هەرگیز دوعای خراپ مەکە.

* دوعا بۆت دەبیتە گەنجینەیەکی زۆر بەکەلك و بەسوود، وەك ماڵی سپی یە بۆ رۆژی تەنگانەو ڕەش، لە ڕۆژی دوایی: دەبیتە خاوەنی پاداشتێکی چاوەڕوان نەکراو، لە بری ئەو دوعایانەی لە دونیادا وەڵام نەدراوەتەوە .

* پێ داگری کردن لە پاڕانەوەو دووبارە کردنەوەو، خۆ بەکەم زانی و، بەترس و ئومێدو هیواوە داوا لە خودای گەورە.

## * ئەو کاتانە لە مانگی ڕەمەزان بە هەل بزانە بۆ دوعاکانت:

١ـ سێیەکی کۆتایی شەو کاتی (پارشێو کردن)، ئەو کاتەیە کە خودای میهرەبان دادەبەزێتە ئاسمانی دونیاو بانگ لە بەندەکانی دەکات، نەکەی لەو کاتەدا تۆش نووستوو بێ ئاگابی.

٢ـ دوای نوێژە فەرزەکان.

٣ـ نێوان بانگ و قامەت.

٤ـ ئەو کاتەی میوانی خودای گەورەی و، زۆر لێی نزیکی کاتی سەجدە.

٥ ـ دوای قورئان خوێندن و، خەتم کردنی قورئانی پیرۆز.

٦ـ شەوی قەدری پیرۆز.

٧ـ هەر ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی ئەو مانگە پیرۆزە دوعایەکت بۆ هەیە، کە ڕەتبوونەوەی نیە، کەوابوو (٣٠)سی دوعا بنووسەوەو ئامادە بکە، بۆ کاتی بەربانگەکانت.

* بەرنامەی رۆژووەوان لەهەر تاکە ڕۆژێکی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز:

١ـ کاتی پارشێو کاتێکی پیرۆزو پڕلەخێرو بەرەکەتە، بۆیە بیقۆزەوەو بەئاسانی لەدەستت نەڕوات.

٢ـ کاتی نوێژی بەیانی.

٣ـ دوای نوێژی بەیانی کاتێکی زێڕینە ئاگاداربە.

٤ـ کاتی چێشتەنگاویش بەهەلبزانەو سوودی لێ ببینەو بۆبەدەستهێنانی زانست و زانیاری و کیتاب خوێندنەوە.

٥ـ دوای نیوەڕۆ تەنها بەنوستن بەسەری مەبە.

٦ـ پاش نوێژی (عەسر)ان کاتێکی زۆر بەنرخە بیقۆزەوە.

٧ـ کاتی مەغریب و ڕۆژئاوا کاتی پاڕانەوەو خزمەتکردنی ڕۆژووەوانانە.

٨ـ نوێژی (عیشا)و (تەراویح) و شەو بەشتی خراپ و بێ سوود و، لەشوێنی خراپ و گوناهان بەسەرمەبە.

* بڕیاری گۆڕانکاری بدە: گۆڕانکاری بەسەر خۆتدا بهێنی کە هەرگیز لەم ڕەمەزانەوە لەپاشملەباسی خەڵك کردن (غەیبەت) نەکەی و، ئەوەی لەمەو پێشیش لەپاشملە (غەیبەت)ت کردووە، گەردەنی خۆتی پێ ئازاد بکەو دوعای خێری بۆ بکە.

## خەڵاتی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بۆ ڕۆژووەوانان:

(لەو مانگەدا ئەو چوار شتە زۆر بڵێنەوە: دوانیان بۆ خۆتان پێویستانەو دەست بەرداری نابن کەبریتی یە لە: داواکردنی بەهەشت، پەنا گرتن لە ئاگری دۆزەخ، ئەو دوانەی کە ڕەزامەندی خودای گەورەی پێ بەدەست دەهێنن ئەمانەن: زۆر شەهادە هێنان، زۆر ـ ئیستیغفار ـ کردنە).

# خەلاتی سێیەم

## پلانت بۆ ئەو وەرزە پڕ لە خێرە

بەڕێزان و خۆشەویستان: کویٚ لەو چیرۆك و بەسەر هاتە ڕابگرن بە ناونیشانی: (دەتوانیت لە کاتی ڕەشەبادا بنووی).

دەفەرموون با بە یەکەوە کویٚی لیٚ ڕابگرین بە مەبەستی پەندو ئامۆژگاری لیٚ هەلٚێنجانو، سوود لیٚ وەرگرتن، ئاوێتە کردنی بە فەرمایشت و فەرموودەکانی خودای گەورەو پێغەمبەری سەروەر(ﷺ)

جوتیارێك زەویەکی لە کەناری دەریایەکدا هەبوو، ڕایگەیاند کە پێویستی بە کەسێك هەیە یارمەتی بدات لە چاندن و بەڕیوەبردنی زەویەکەیدا، بەلاٚم زۆرینەی خەلٚك نەیانتوانی ئەو کارە قەبولٚ بکەن، لە ترسی ڕەشەبای توندی زەریا، چونکە کاتێك ئەو ڕەشەبایە هەلٚیدەکرد، زەرەرو زیان و وێرانکاریەکی زۆری دەگەیاندە هەموو ناوچەکانی کەنار!

لە یەکێك لەو ڕۆژانەدا، کە کابرای خاوەن زەوی چاوەڕوانی کەسێکی دەکرد کە وەکو جوتیار کاری لا بکات، پیاوێکی کورتە بالاٚی لاوازی تەمەن مامناوەند بۆ ئەو مەبەستە هاتە لای.

خاوەن زەوی پرسیاری لیٚ کرد: ئایا تۆ جوتیارێکی بە تواناو شارەزای؟

ئەویش لە وەلاٚمدا گوتی: (دەتوانم بنووم کاتێك کە ڕەشەباو گێژەلٚوکە هەلٚدەکات)!

خاوەن زەوی زۆر سەری سووڕما لەو جوتیارەو لە مەبەستەکەی نەگەیشت، بەلاٚم چونکە کەس ئامادەلە زەویەکەیدا کاری بۆ بکات، بۆیە بە ناچاری ڕازی بوو!

جوتیارە کورتە بالاٚکە زۆر بە چوست و چالاکی دەستی بە ئیش و کارەکانی کرد، سبەینان تا خۆرەتاو تا خۆرئاوابوون بیٚ وچان کاری دەکرد.

تا لە شەوێکی ئەنگوستە چاودا ڕەشەبایەکی توند هەلٚیکرد.

کابرای خاوەن زەوی بە هەڵەداوان و پەشۆکاوی ڕاکردنەوە، خۆی گەیانـدە جوتیارەکـە بـۆ یارمەتی دانی، هاواری لێکرد: هەڵسە ڕەشەبایەکی توندە، ئێـستا هەرچـی هەمانـە وێرانـی دەکات و تێکی دەشکێنێ و لەناوی دەبات و ڕەنجە ڕۆ دەبین!

خێراکە با بە یەکەوە شتەکان بپێچینەوەو مەحکەمیان بکەین، بەر لەوەی ڕەشـەباکە بـە هەوایاندا ببات!

جوتیارە بچکۆلە ژیرەکەش گوتی: بۆچی هەڵستم قوربان، مەگەر پێشتر پـێم نـەگوتبووی دەتوانم لە کاتی ڕەشەبادا بنووم؟!

کابرای خاوەن زەوی زۆر تووڕەبوو، خەریك بوو بـێ سـێ و دوو یەکـسەر دەری بکـات و، وەدەری بنێ، بەڵام خێرا چووە دەرەوە تا ئەوەی بۆی دەکرێت ڕزگاری بکات و، توندی بکات.

کاتێ چوو بینی هەموو شتێك لە شوێنی خۆی داندراوەو، جوان بەسـتراوەتەوەو، تۆکمـەو توندو تۆڵ کراوە، هیچ شتێك پشت گوێ نەخراوە!

خەرمانە قرشەکان بەسراونەتەوەو بە جـوانی داپۆشـراون، مانگـاو مـەڕو ماڵاتـەکان لـە گەوڕەکانی خۆیاندان، پەلەوەرەکان لە کولانەو هێلانەکانی خۆیاندان، هەرچی دەرگاو پەنجـەرە هەیە داخراوەو مەحکەم داخراون!!

بۆیە ڕەشەباکە نەیتوانی بوو هیچ شتێك بەرێت!! چونکە هەموو شتەکان بـە پـەرژینێکی سەلامەت دەورە درابوو، هیچ شتێك پشتگوێ نەخرابوو!

ئا ئەو کاتە خاوەن زەوی لە مەبەستی کابرای جوتیـار تێگەیـشت: کـە مـرۆڤ دەتوانێـت بنوێت، کاتێك ڕەشەبا هەڵدەکات، مانای چی یەو ؟! چۆنە؟!

با بزانین چۆن سوود بەخش دەبـین لـە هەلـە زێڕینـەکانی مـانگی ڕەمـەزانی پـیرۆز، لـە سۆنگەی ئەو بەسەرهات و چیرۆکەوە: برای سەنگین و بـەڕێز ئـەوە خـودای نیعمـەتی ئـەوەی لەگەڵ کردوی کە، کە تۆی گەیاندەوە ئەو وەرزە پڕ لە خێـرو بەرەکەتـە، کـەوابووقۆڵی خـۆت هەڵماڵەو، خۆت یەکلا بکەوە بۆ داکردنـی چـاکترین زادو زەخـیرە، کـە باشـترین و چـاکترین توێشووش (تەقوا) ی خودای گەورەیە.

١ـ کەوابوو لەو زەویە بە پیت و فەڕەدا، کە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزە، جوانترین شەتل و نەمام دابچینە.

٢ـ هەوڵدە ڕەشەبای خراپەکاری و هۆکارەکانی گوناهو تاوان بەسەرتدا زاڵ نەبێت و، دوو دڵ مەبە لە ئەنجامدانی کاری چاکەو، سڵی لێ مەکە.

٣ـ ژیری بە گەورەو بچوکی و بەهێزو لاوازی نیە، بەڵکو بە بەگەڕ خستنی ژیری و ئەقل، سەخترین کار ئەنجام دە

٤ـ کاتی هێزو توانایی و، دەست بە تاڵی و لەش ساغی بە هەل بزانە، بەر لەوەی بێ هێزی و، سەرقاڵی و، نەخۆشی ڕووت تێ بکات.

٥ـ کارە چاکەکانت لە ڕەمەزان ئاسوودە و دڵنیات دەکات لە ڕەشەباکانی دوای مردن، نوستنێك دەنویت زۆر بە ئارامی و لە ناو گۆڕەکەت لە خۆشترین ژیاندا دەبی.

٦ـ ڕەمەزان مانگی تەقوایە کەوابوو: ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ {سورەتی ئالی عیمران: ئایەتی١٣٣} واتە: (بەپەلە بن و پێشبڕکێ بکەن تادەگەنە لێخۆشبوونی پەروەردگارتان و بەهەشتێك کە پانایيەکەی ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوەو ئامادەکراوە بۆپارێزگاران)

## ئەگەر دەتەوێت لە زەرەرمەندو دۆڕاوان نەبیت:

یەکەم: بڕیار بدە هەموو نوێژەکانت بە کۆمەڵ بێت، لە (١٠) دە ڕۆژ پێش هاتنی ڕەمەزانەوە دەست پێ بکە، ئەگەر نا دەتوانی (١٠) ڕۆژی دوای ڕەمەزان بەردەوام بی،تا (٤٠) چل ڕۆژەکە تەواو بکەیت،بۆ ئەوەی بەر ئەوموژدەی پێغەمبەری خۆشەویست بکەوی (ﷺ) کە دەفەرمووێ: (ئەوەی چل ڕۆژ هەموو نوێژەکانی بە کۆمەڵ بێت، بە (الله أکبر) ی نوێژ دابەستن ڕابگات، خودای گەورە لە دوو شت رزگاری دەکات: رزگاری دەبێت لەئاگر، وەرزگاری دەبێت (نیفاق) دوو ڕوویی) {تیرمیزی گێراویەتیەوە}

دووەم: ئاگاداری چاکترین و باشترین هۆکاری بەدەست هێنانی خێرو پاداشت بە ئەویش قورئانی پیرۆزە، بیخوێنەوە، لەبەری بکەو، لە ماناکانی شارەزابە، بەلای کەم رۆژانە جوئێك بخوێنە.

سێ یەم: ماڵ و مندالەکانت لە بیر مەکە، چۆن غەمی خۆراك و بەرگیان و،لایەنی ماددیان دەخۆی، بەهەمان شێوەش بەتەنگیانەوە بەو غەمی دوا رۆژوو قەبرو قیامەتیان بە خودای گەورە دەفەرمووێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾ {سورەتی التحريم: ئایەتی ٦} واتە: (ئەی ئەو کەسانەی کەباوەڕتان هێناوە خۆتان و کەسوکارتان بپارێزن لەئاگرێك کە سووتەمەنیەکەی خەلکی و بەردە، سەرپەرشتیاری ئەو دۆزەخ و ئاگرە، جۆرە فریشتەیەکن کەزۆر دلڕەق و توندو تیژن، نافەرمانی خوا ناکەن لە هیچ شتێکدا کەفەرمانیان پێ بدات و هەرچی فەرمانێکیان پێ بدرێت ئەنجامی دەدەن)

کاتێ بۆ پارشێوکردن هەڵدەستی بزانە خودای گەورەش دابەزیوەتە ئاسمانی دونیا، بۆیە تۆش بەئاسانی بەسەری مەبە:

١ـ (١٠ـ١٥) خولەك قورئان بخوێنە.

٢ـ (١٠ـ١٥) خولەك نوێژی ویترەکە بکە.

٣ـ(١٥ـ٢٠) خولەك کڕنۆش ببەو دوعای تێدا.

بڕیاری گۆڕانکاری بدە لەو ڕەمەزانەوە: رێزو قەدری کات بزانی و کاتەکانت بە فیڕۆ مەدەو، پڕی بکەوە بەکاری خێرو بەسوود.

لە کۆتاییدا دەڵێم: (الدنيا ساعة، اجعلها طاعة، النفس طماعة، عودها القناعة)

واتە: (دونیا کاتیەو کورتە، بە تاعەت و خودا ناسی بەسەری ببە، نەفسی مرۆڤ تەماعکارە بۆ ماڵی دونیا، لەسەر ڕازی بوون بە پشکی ڕای بهێنە)

# خەلاتی چوارەم

## فراوانی ڕەحمەتی خودا

یەکێ لە خەڵات و بەخششەکانی خودای گەورە لەو مانگە پیرۆزەدا ئەوەیە کە سێ یەکەکەی سەرەتاکەی ڕەحمەتی خودای گەورەیە، دیارە خوداناسی چاکە کردن هۆکاری زیادبوونی ئەو ڕەحمەتەی خودای گەورەیە،بە پێچەوانەوەش گوناهو تاوان و خراپەکاری هۆکارێکن بۆ نەمان و پچڕانی ئەو ڕەحمەتە زۆر و بێ بنەی خودای گەورەو میهرەبان، بۆ دەرخستنی ئەو ڕاستیەش ئەم بەسەر هاتەتان بۆ دەگوازمەوە، ئێوەش بە کوێی دڵ و دەروونتان لێی ووردبینەوەو، پەندو کەلکی چاکی لێ هەڵێنجن:

مامۆستایەکی زۆر بەڕێز: فەرمووی چوومە سەردانی مامۆستایەکی ئایینی لە گوندێك، مامۆستاکە فەرمووی: لەو ماوەیەدا سولحێکم کردووە، بەڵام سەیرو سەمەرەترین سولح و پێکهاتن کە تا ئێستا کردبێتم!

گەنجێکی خەڵکی ئەو دێیە بەر لە ماوەیەك ئافرەتێکی هێنا، دوای ماوەیەك بە خۆشی و بەختەوەری لەگەڵ یەك ژیان بەبێ ئاستەنگ و گیروگرفت بوون، پاشان دوای ئەوەی خودای گەورە منداڵێکی چاو گەش و جوانی پێیان بەخشی، کاتێ تەمەنی ئەو منداڵە خنجیلانەیە بوو بە سێ مانگ، ئەو ژن و پیاوە گێشەیەکیان لە نێوان دروست بوو نێوانیان تێك چوو، ئافرەتەکە زیزبوو چۆوە ماڵی باوکی، چوار مانگ ئەو ژن و پیاوە لێك دابڕان و ئەو منداڵە بێ تاوانەش لەنێوانیان چوار مانگ ژیانی کولە مەرگی و ناسۆری چێشت، دوای ئەو ماوە دوورو درێژە ئەو ژن و پیاوە پەشیمان بوونەوەو زۆر حەزیان دەکرد بگەنەوە بە یەکترو، بەیەکتر شادببنەوە، بەڵام باوکی ئافرەتەکە رازی نەدەبوو کچەکەی ڕادەستی پیاوەکەی بکاتەوەو بیگێڕێتەوە ماڵی خۆی، دوای ناردنی چەندین ریش سپی و کەسایەتی و پیاوماقول، چەندین هەوڵ و کۆشش کرا لەگەڵ باوکی ئافرەتەکە، بەڵام بێ هوودە و بێ سوود بوو، ئەو مامۆستایەی ئەم چیرۆکەمان بۆ دەگێڕێتەوەو شایەد حاڵی ڕووداوەکەیەو بەو سولحە هەستاوە،

ووتی: ئەو کوڕە داماوە پەنای هێنا بەر من و داوای لێ کردم کە چارەسەرێکی بۆ بکەم، خێزانەکەی بۆ بهێنمەوە، منیش لەگەڵ چەند ریش سپی و پیاو ماقولێك ناوی خودام لێ هێنا چوومە ماڵی باوکی ئافرەتەکە کە لە دێیەکی تر بوو، دوای چەندین هەوڵ و قسەو باس، هەر موکرِ لەسەر نەدانەوەی کچەکەی و دەی ووت: دەبێت لێك جوابینەوەو، بەهیچ شێوەیەك ئەو کچەی من ناچێتەوە لای ئەو کوڕەو ئەو ماڵە، بەڵام ئێمە کۆڵمان نەداو بەهەر شێوازو شێوەیەك بوو رازیمان کردو ئافرەتەکەمان لەگەڵ خۆمان هێناوە ماڵی پیاوەکەی و، کاتێ ئەو ئافرەتەمان لەگەڵ ئێمەدا بوو، بۆ گەڕانەوەی بۆ ماڵەکەی خۆی زۆر بەپەلەو بە پەرۆش و پەرێشان بوو، وەك مەنجەڵ دڵ و دەروونی دەکوڵا بۆ منداڵە چاوگەشەکەی کە چوار مانگە نەیبینیوەو لێی دابڕاوە، بۆیە کە گەیشتینەوە ماڵەکە ئەو ئافرەتە زۆر بە هەڵەداوان تەنها سەیری باوەشی ئافرەتەکانی دەکرد، تا جگەر گۆشەکەی ببینێتەوە لە باوەشی بگرێت، بەڵام دوای چوار مانگ لێك دابڕان نای ناسێتەوە، نازانێ کامیان منداڵەکەی ئەوە! تا یەکێ لە ئافرەتەکان منداڵەکەی بۆ دەهێنێت و بەبەر باوەشی دادەکاتەوە، ئەو دایك و منداڵەو ئەو دوو خۆشەویستە، کە تەنها پەتی سۆزو بەزەیی خودای گەورە، بەیەکەوەی گەیاندوون، بۆیە ئەو دایکەی بۆ ماوەی چوار مانگە چەرگی سووتاوەو لە سۆزو خۆشەویستی منداڵە چاو گەشەکەی دوور خراوەتەوە، هەر لە دەرگای حەوشەکەوە تا ناو حەوشەکە بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە منداڵەکەی بە سینگی خۆی وەنابوو بۆنی دەکردو ماچی دەکردو تەماشای ناو چاوەکانی دەکرد، مامۆستای بەرێز دەفەرمووێ: من لە خۆشیان تەنها سوپاسی خودای گەورەم دەکرد کە بە هۆی منەوە ئەو دایك و منداڵەی بەیەك شاد بوونەوە، ئەو خەڵکەی کە لەو ماڵە کۆ ببوونەوە تەنها سەیری ئەو دایکەو منداڵەکەیان دەکردو، هەندێك فرمێسکیان بە چاواندا دەهاتە خوار، بەڵام ئەوەی لە بیرو خەیاڵ و ئەندێشەی کەسدا نەبوو کە ڕوو بدات، سەیرترین ڕووداو کارەسات! ئەوە بوو ئەو منداڵە بێ زمانە کە ناتوانێت بەهیچ شێوەو شێوازێك سۆزو خۆشەویستی خۆی بۆ دایکەکەی دەربڕیت و! بۆیە ئەو منداڵە هیچ شتێکی لە دەست نەهات وەك سۆزو خۆشەویستی بۆ دایکەکەی دەری بڕێت، تەنها بە چاوەکانی

توانی سەیری نێوچاوەکانی کردو دواییش هەناسەیەکی قوولی هەلکێشاو، مای لار بۆوە رۆحی دەرچوو گیانی سپارد.

ئەمە نموونەیەکی زۆر بچوکە سەبارەت بە رەحمەتی خودای گەورەو میهرەبان، دەی ئەگەر تا ئێستا لە رەحمەتی فراوان و گەورەی خودای گەورە نەگەیشتووی و هەست دەکەی دووری لەو رەحمەتە دەفەرموو با لەو رەمەزانە خۆمان شایستەی ئەو رەحمەتە بکەین.

ئەو مانگە پیرۆزە مانگێکە مرۆڤ بەروون وئاشکرایی بەهەموو هەست و نەستەکانی هەست بە گەورەیی سۆزو میهرەبانی خودای گەورە دەکات، بە تایبەت لەم روانگانەی خوارەوە:

١ـ هەموو ساڵێك دوای تەواوبوونی مانگی رەمەزان موسڵمانان باس لە خۆشی و نیعمەتەکانی مانگی رەمەزان دەکەن.

٢ـ هەژارو نەداران و منداڵانی بێ باوك و نەخۆشان لەو مانگەدا لە رووی ئابوورییەوە دەبووژێنەوەو، دەرووی خێریان لێ دەکرێتەوە.

٣ـ لە هەموو کاتێك زیاتر موسڵمانان چاکەکاری و دینداری دەکەن و پاداشت و زەخیرە بۆ خۆیان دادەکەن.

٤ـ هەموو رۆژێك لە رۆژەکانی ئەو مانگە جەژن و خۆشیەکی تێدایە بۆ موسڵمان ـ کە بەربانگ کردنەوەیە .

٥ـ موسڵمان لەو مانگە هەست بە دەستی پەروەردگاری دەکات، کە هەموو شتێکی بۆ ئاسان و فەراهەم دەکات.

٦ـ رزق و رۆزی تێدا فراوان و زۆر دەبێت.

٧ـ موسڵمان هەست بە تام و چێژێکی رۆحی دەکات، هەست دەکات کە رەحمەتی خودای گەورەی لێ نزیکە: ﴿إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ {سورەتی الأعراف: ٥٦}

## گەنجینەی زانیاری:

* خودای گەورە (١٠٠) سەد رِەحمەتی هەیە، تەنها یەك رِەحمەتی دابەزاندووە بۆ سەر زەوی، (٩٩) نەوەدو نۆی هەڵگرتووە بۆ رِۆژی دوایی.

* هەموو ناوە پیرۆزو سیفاتە بەرزەکانی خودای گەورە کە باس لە رِەحمەتی دەکات، بە چەندین ووشەو دەستەواژە هاتووە، وەك (الرحمن الرحيم)، (الغفار ـ الغفور ـ غافر).

* ئەگەر دەتەوێت بەر رِەحمەتی خودای گەورە بکەویت، سۆزو بەزەییت هەبێ بەرامبەر بە خەڵك: پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرمووێ: ((إرحموا من في الأرض يرحمكم من في السماء)).

* رِەحمەتی خودای گەورە لە پێش قین و تورِبوونیەتی.

بەرنامەت لەپارشێوەوە تانوێژی بەیانی:

* بەر لەچارەکێك (١٥)خولەك لەمزگەوت ئامادە بە.

* هەر کە چوویە ناومزگەوت دوو رکات نوێژی (نوێژی تحیەی مزگەوت)بکە.

* تا بانگدان هەندێ زیکربکە، یابڕێك قورئان بخوێنە

بریاری گۆڕانکاری بدە: سەردانی کردن با یەکێ لە بەرنامەکانی ئەو مانگە پیرۆزە بێت هەوڵبدە هەفتەی دوو رِۆژ تەرخان بکە بۆ سەردانی کردن و بەسەرکردنەوەی خزم و دۆستەکانت، بەتایبەت ئەوانەی سەردانیت ناکەن تۆ لەپێناوی خودای سەردانیان بکە، تا زیاتر نزیك ببیتەوە لە رِەحمی خودای گەورەو میهرەبان.

## رِەحمەتی خودای گەورە لە بێشکەوە تا دوا مەنزلگا:

(کاتێ لە ناو تاریکیەکانی رِەحمی دایکتی، خودای گەورە بە تاکە رِەحمەتێکی خۆی تۆی لە یادە، کۆشت دەکات بە رزق ورۆزی، لە رِێگای دەمارێکەوە، کاتێکیش چاوهەڵدێنی بەو دونیایە ئەو تاکە رِەحمەتەی دەکات بەدوو، بەدوو کانیاوی زوڵال لە سینگی دایکتەوە بە هانات دێت، دواییش دوای دوو ساڵ، ئەم دوو لەرِەحمەتەی خۆی دەکات بە چوار، چوار

دەرگای ڕەحمەتی خۆیت لێ دەکاتەوە، کە خواردنی (ئاژەڵی ـ گیایی ـ ئاوی ـ)، ئـەو کاتـەی دونیا جێ دێلی و بەرەو مەنزڵگای یەکجارەکی دەڕۆی خودای گەورە ئەو چوار ڕەحمەتەی خۆی دەکات بەدوو قات، چوارەکە دەبێت بە هەشت، هـەر هەشـت دەرگـای ڕەحمـەتی خۆیـت بـۆ دەخاتە سەر پشت، کە دەرگاکانی بەهەشتە پان و بەرینەکەی خۆیەتی)

# خەلاتی پێنجەم

## ڕەمەزان مانگی ڕاستکردنەوەی هەڵە گەورەکانی ژیانە

هەموو مرۆڤێك هەڵە دەکات، ڕێگای لێ وون دەبێت، بەڵام چاکترین هەڵەکار ئەو کەسەیە کە هەڵەکەی ڕاست دەکاتەوەو، بەخۆدا دەچێتەوەو لە سەری بەردەوام نابێت، وەك پێویستە بزانین هەڵە تا هەڵە جیایەو، هەڵەی گەورەو بچوك هەیە، کەوابوو با ئەو مانگە پیرۆزو پڕ لەخێرو بەرەکەتە بکەینە وێستگەی بەخۆدا چوونەوەو ڕاست کردنەوەی هەڵەکانمان و وەرزی پێکهاتنەوەو خۆ نزیك کردنەوە لە خودای کاربەجێ و میهرەبان، ئێستا بۆ ئەوەی بزانین ئایا هەست و نەستێکی زیندوو هۆشیارمان هەیە، تا کاراو کارامە بێت لە دەست نیشان کردنی هەڵەکانمان دەفەرموون لەگەڵم بن، بۆ چیرۆك و بەسەرهاتی ئەم پیاوە ژیرو تێگەیشتووە، چۆن هەڵێك دەقۆزتەوەو بۆ چاکردنەوەی هەڵەکانی و پەیوەستی دەکات بە دین‌و قیامەت و دوارۆژی:

بەڵێن بوو لە ڕۆژی هەینی بەیانی زوو لەڕێگای ئەنتەنێتەوە لەگەڵ خێزانەکەم بەیەکەوە قسە بکەین، چونکە ماوەیەك بوو لەیەك دابڕابووین، من لە یەکێك لە وڵاتە عەرەبیەکاندا دەم خوێندو، ئەویش لەگەڵ (خولود) خانی کچە خنجیلانەکەمان لە (میسر)دا مابۆوە، بەیانی زوو هەستام بۆ نوێژی بەیانی وچووم بۆ مزگەوت و، مامەوە لەمزگەوت تا هەموو زیکرەکانی بەیانیم خوێندو پشکی ڕۆژانەی قورئانی خۆشم خوێند، ئینجا گەڕامەوە بۆ ماڵە ساردو سڕەکەم کە تەنها خۆم تێیدا دەژیام و ماڵێکی کش و مات، بەڵام ئاوەدان بەکرداری چاك و باش، لەبەر پشوو بوو لەو ڕۆژەدا هەر چی ئیش و کاری خۆم هەبوو لەو ڕۆژەدا ئەنجامم دەدا، بۆیە دەستم کرد بە شوشتن و ئوتوو کردنی جلەکانم، کە تەواو بووم نانی بەیانیم بۆ خۆم ئامادە کردو نانەکەم خوارد، دوایی خۆم شووشت بە مەبەستی غوسلی ڕۆژی هەینی‌و، چوار رکات نوێژی چێشتەنگاوم کردو، ئینجا بەدەم ووتنی دوعای چوونەدەرەوە بەرێ کەوتم، وەك لە سوونەتی پێغەمبەری خۆشەویستدا هاتووە(ﷺ)، وە بە مەبەست و

نیەتی چوونە مزگەوت هاتمە دەر تا خودای گەورە بەهەر هەنگاوێك چاکەیەکم بۆ بنووسێت، چونکە کاتی بەڵێنەکەم لەگەڵ خێزانەکەم دوای نوێژی هەینی بوو، شوێنەکەش دووربوو پێویستی بە هۆکاری گەیاندن هەبوو تا بەگەمە شوێنی مەبەست، چوومە وێستگەی پاسەکان هەر کە گەیشتمە ئەوێ پاسێك هات کە ژمارەکەی (١٠٥) بوو، بەتەواوی نەم دەزانی هێڵی کام شوێنە، بەڵام وای بۆ چووم کە دەچێتە ئەو شوێنەی کە من بۆی دەچم، بۆیە بەخێرایی پلیتەکەم بڕی و سواربووم، لە شوێنێك دانیشتم، کە پاسەکە دەستی بە ڕۆیشتن کرد، منیش قورئانە بچوکە گیرفانیەکەم دەرهێنا کە وەك هاوڕێ و هاودەمم بوو بەردەوام لەخۆم دانەدەبڕی، دەستم کرد بە خوێندنەوەی تا ئەو کاتەم لە کیس نەچێت، دیارە چاکترین خێرو چاکەش ئەوەیە کە لەو ڕۆژی هەینیەدا سورەتی (الکهف) بخوێندرێت، تا ئەو نوورەم دەسکەوێت کە نێوان هەردوو هەینی ڕووناك دەکاتەوە، وەبەمەبەستی جێ بەجێ کردنی سوونەتی پێغەمبەری ئەکرەم(ﷺ).

بەڵام دوای ماوەیەکی زۆرو دوورو درێژ لە ڕۆیشتنی پاسەکە دەرکەوت بە هەڵە سواری ئەو پاسە بوویمەو، ئەو پاسە ناچێتە شوێنی مەبەستی من و ئەو ڕێگایەی من گرتووتمە بەر هەڵەیە بەرەو مەبەست و ئاڕاستەیەکی تردا دەڕوات، زۆر دڵم توندبوو ماوەیەکی کەم بیرم کردەوە ئایا بەردەوام بم تا کۆتایی یا دابەزم و بە پاسێکی تر بگەڕێمەوە؟

یەکسەر بڕیارمدا هاتمە خوارەوەو سواری پاسێکی تربووم و تا گەیشتمەوە وێستگەی پاسەکان و لەوێ پرسیارم لە یەکێ کرد، شوێنی وەستانی پاسەکانی ئەو شوێنەی من بۆی دەچووم پێ ووتم و ژمارەی پاسەکەشی بۆ دیاری کردم. دوای ماوەیەك پاسی ژمارە (٥٩) هات سواری بووم، بەڵام بەر لەوەی پلیت ببڕم پرسیارم لە شوفێرەکەی کرد بەرەو کوێ دەڕوا ئینجا پلیتم بڕی سوار بووم، کاتێ پاسەکە کەوتە ڕێ بیرو خەیاڵم هەر لای ئەو ڕووداوەی پێشتر بوو، لەو بیرکردنەوەو خەیاڵەدا بیرێکی زۆر سەیرم بۆ هات کە ڕای چلەکاندم و هەموو لەشی هەژاند، ئەویش ئەوەبوو ئەگەر هەڵەیەکی وا بچوك لە ژیانمدا ئەوەندە پەریشانی کردبم و، بەو ئەندازە لێی زەرەرمەندو ماندوو ببم، کە بوارو توانای چاکردنەوەو بە

خۆداچوونەوەم هەبوو؟! ئەی ئەگەر ئەو مەبەست و ئامانجە گەورەو گرنگەی کە من هەوڵی بۆ دەدەم هەموو هەوڵ و ماندوو بوونم بۆ گەیشتن بەو ئاوات و ئامانجەیە.

ئەگەر لە گرتنی ئەو رێگایەدا هەڵە بم چی بکەم؟!

چۆن و کەی قەرەبووی ئەو هەموو هەڵانە بکەمەوە؟!

کەی بە خۆدا بچمەوە؟!

لە کوێ هەڵەکانم چاك بکەمەوە؟!

ئەی ئەو کەسەی خۆت بە موسڵمان دەزانی: بزانە تۆ بەندەی خودای گەورەی، خودای کاربەجێ لە جوانترین و باشترین شێوە بە دەستەکانی خۆی تۆی دروست کردووە، کاروبارو هەڵسوڕاندنی ئەو بوونەوەرەو تۆش بەدەستی ئەوەو رۆژانە بەلای کەم حەڤدە ئەوەت بیر دەخاتەوە کە دەڵێی: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ {سورەتی الفاتحە: ئایەتی ٢}

دەی ئەگەر تۆ بڕوات بەوە هەیە دەبێ بڕواشت بەوە هەبێت کە هەر ئەو خودایە شایستەو شایەنی پەرستنە، هەر ئەویش شایستەو شایەنە بۆ ئەوەی فەرمانڕەواییت بکات و لە کێشەو گرفتەکاندا پەنا تەنها بۆ بەرنامەو حوکمەکانی ئەو ببەیت.

ئەو بەسەرهاتە پێم دەڵێت بەسە تاکەی دوای ئەوەی چەندین مانگی پیرۆزی رەمەزانت بەرێ کردو، نوێژت کردو بەرۆژوو بووی و نوێژی تەراویحت کردو، لەدە کۆتاییەکانیشدا لە مزگەوتدا مایتەوە، لە سەردەمی ئەنتەرنێت و تەکنەلۆژیادا هەر چاو بەستەو چاو نەکراوە بیت لە دینەکەتدا، تا ئێستاش دڵت بەندەو وابەستەی چەندین بەرنامەو بیردۆزەی ئەو تۆیە کە لە هەمووی باوتر لەو سەردەمەی ئێستا عەولەمەو عەلمانیەت و دیموکراسی یە کە نەك هەر گونجاو رێك نیە لەگەڵ ئایینەکەت بەڵکو دژە لەگەڵ ئایین و، قورئان، سوونەتی پێغەمبەرەکەت(ﷺ).

ئایا دەزانی (عەلمانیەت) مانای چیەو؟

ئاگاداربە! (عەلمانیەت) لە بنەڕەتدا هیچ پەیوەندیەکی بە (علم) زانستەوە نیە، بەڵکو لە زمانی ئینگلیزی لە ووشەی(secularism) بەواتای (بێ دینی) یا بەمانای (دونیاداری) دێت.

کەوابوو (عەلمانیەت) واتە: جیاکردنەوەی دین لە دەولەت و حوکمڕانی.

دائیرەی معارفی بەریتانیش پێناسەی کردووەو دەلێت: بزووتنوەیەکی کۆمەلایەتیە ئامانجی گۆڕینی ئاڕاستە کردنی خەلکانە لە گرنگی دان بە دوارۆژی دوایی، بۆ گرنگی دان بەدونیا.

(عەلمانیەت) بۆ چی و لە کوێ سەری هەلدا؟

ئەم بیرۆکە یەکەمجار لە ئەوروپا سەری هەلدا دوای ئەوەی پیاوانی کەنیسە بەتەواوی لە دینی مەسیحی لایانداو، ستەمەکی بێ ئەندازەو بێ سنووریان لە خەلکەکەیان دەکرد بەناوی ئایینەوە بۆ نموونە:

* دژایەتی کردنی زانست و زانیاری، زاناو زانست پەروەران بە ڕوون و ئاشکرایی.

* سەپاندنی باج بە ناوی پێدا چەکی خۆ کڕینەوەو لێخۆشبوون.

* چەوساندنەوەی خەلکان بەناوی دینەوە.

* زۆر بوونێکی بێ ئەندازەو بێ سنوور لە کتێبە ئاسمانیەکەیان و ڕاوبیرو بۆچوونی پیوانی کەنیسە کە ببووە مایەی سەر لێ شێوان و سەرگەردان بوونی خەلکەکەو بێزاربوونیان.

بۆیە لە فەرەنسا ڕاپەرین و شۆرشێك سەری کە تەواو دژی کەنیسەو بریارەکانی کەنیسەبوو، هەندێ کەسیی داخ لە دلّ و رگەردان یخەلکەکە سلی کی ڕوون و ئاشکرای دەکرد لەگەلّ زانست و زانیاری و ئەو بابەتە نوێ و سەردەمیانەی کە زاناکان دایان دەهێنا وەك:

* سوڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا.

* چ پەیوەندیەك لە نێوان ئەو بیرۆکەو ووشەی (علمانیەت) هەیە؟

کاتێ ئەو بیرۆکەیان هێناناو وولاتانی ڕۆژئاوای ئیسلامی زانیان بە ناوەڕاستەقینەکەی خۆی بازاڕی نابێت و موسلمانانیان پێ هەلناخەلەتێ بۆیە هەستان بەرگێکی ساختەیان بەبەر ئەو ووشەیەدا کردو لەو نێوەندەشدا پیرۆزترین ووشەیان کردە قوربانی و، لەمێژووی مرۆڤایەتی گەورەترین زولم و ستەمیان لەم ووشە پیرۆزە کرد، تا ئێستاشی لەگەلدا بێت موسلمانێکی زۆر بەم ناوە هەلخەلەتاوەو فێلی لێ کراوەو چاوی بەستراوە، پێی وایە

(عەلمانیەت) بە واتای زانست و زانیاری یە، نازانن بە واتای بێ دینی و دوورخستنەوەی خەڵکە لە خودای گەورەو دینەکەیەتی.

لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت: ئەویش ئەوەیە بۆچی لە ناو هەموو بیرۆکەکان زیاتر تیشك خرا سەر (عەلمانیەت)؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: چونکە (عەلمانیەت) سەرچاوەو دایکی هەموو بیرۆکەو بیردۆزەکانی ترە، هەرچی بیرۆکەو بیردۆزە هەیە وەك: دیمۆکراسی ـ شۆشیالیست ـ ئیشتیراکی ـ سەرمایەداری ـ لیبرالی ـ مارکسیسزم ـ شیوعیەت ـ هتد ...هەر هەموویان لق و پۆپی داری بۆگەنی (عەلمانیەت) ن.

## * بەرنامەت لەدوای نوێژی بەیانی تا ڕۆژهەڵات:

ئەو کاتە کاتێکی زێرین و پڕ لەخێرە وابزانە تۆ لەمەککەی پیرۆزی هەموو ڕۆژێك زۆر بەئاسانی دەتوانی (عومرە)یەکی تەواوو بێ کەم وکورتی بهێنیتەوە، پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) دەفەرمووێ: ((مَنْ صَلَّى الفجر في جماعة، ثم قَعَدَ يذكرُ الله، حتى تطلُع الشمس، ثم صلى ركعتين، كانت له كأجر حجة وعمرة، قال : قال رسولُ الله(ﷺ): ((تامة تامة تامة)) {تیرمزی گێراویەتیەوە} واتە: (ئەوەی نوێژی بەیانی بەکۆمەڵ بکات، پاشان دابنیشێت زیکری خودای گەورە بکات تارۆژ هەڵدێت، ئینجا دوو رکات نوێژ بکات پاداشتی حەج و عومرەیەکی بۆ دەنوسرێت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) سێ جار فەرمووی: (حەج و عومرەیەکی بەتەواوی بەتەواوی بەتەواوی)

لەو کاتەدا:

١ـ هەموو زیکرەکانی بەیانیان بکە، هەر ڕۆژێکیش زیکرێك لەبەر بکە.

٢ـ جوزئێك قورئان بخوێنە.

٣ـ دەرسێکی شەرعی بخوێنە.

٤ـ کیتابێك بخوێنەوە.

٥ـ سێ چوار ناو لەناوە پیرۆزەکانی خودای گەورەو میهرەبان لەبەر بکە.

بریاری گۆڕانکاری بدەو: ئەو ڕەمەزانە بگێڕە بە وێستگەی گۆڕانکـاری و بەخۆداچـوونەوە لەبیروباوەڕو هەڵسوکەوت و کارو کردەوەکانت.

(الناس نیام فإذا ماتوا انتبهوا)

واتە: (خەڵکان نووستون کاتێ مردن هۆشیار دەبنەوەو بە ئاگا دێنەوە)

# خەلاَتی شەشەم

## کاتێ دینت نەبێ ڕێزیشت نابێ

ئەم جارەش لە خزمەت بەڕێزتان بەیەکەوە کوێ دەگرین لە چیرۆك و بەسەرهاتێکی ڕاستەقینە، بۆ ئەوەی بزانین ئەگەر دین و دینداری نەبێت ژیان هیچ ماناو تام و چێژێکی نیە، بە تایبەت لەو مانگە پڕ لە خێرو بەرەکەتە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، کاتێ کە موسڵمان تۆزێك گێچی ئیمانی دەبزوی و بەرز دەبێتەوە، ئەو کاتە زیاتر زۆرتر هەست بەکەسایەتی و مرۆڤایەتی خۆی دەکات، هەر بۆیەشە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێ:((لو تعلمون ما في رمضان لتمنيتم كل سنة أن تكون رمضان)) واتە: (ئەگەر بتانزانیبا چ خێرو بەرەکەتێك لە مانگی ڕەمەزاندا هەیە خۆزگەتان دەخواست کە بە درێژایی ساڵ ڕەمەزان بووایە)

دەفەرموون لەگەڵ ئەو بەسەرهاتەی ئەم جارە با بزانین چی تیایەو چی لەخۆ گرتووە:

موسڵمانێك دەگێڕتەوە دەڵێت چوومە وولاَتی هیند، خەڵکێکی ئێستاش لە کوردستانی خۆمان بەمەبەستی چارەسەری نەخۆشی و مەبەستی تر سەردانی ئەو وولاَتە دەکەن، کە ئەوە نیشانەی پێشکەوتن و زانست و زانیاری خەڵکی ئەو وولاَتەیە، ئەو موسڵمانە دەڵێت کاتێ چوومە ئەو وولاَتە زۆر شتی سەیرو سەمەرەو دیمەنی جوان و دڵڕفینم بینی، دوای ئەوەی لە هوتێل دابەزیم و پشوویەکمدا لەگەڵ وەرگێڕەکە پیاسەیەکی ناو بازاڕمان کرد، دوای گەڕان سووڕانێك، بینیم مانگایەکی زەبەلاح و زۆر گەورە بەناو بازاڕدا وەك پاشا دەڕۆیشت، ئەوەی بەرامبەری بهاتبا هەردوو دەستەکانی جووت دەکردو لە سەر نێوچاوانی خۆی دادەناو بەرامبەر مانگاکە خۆی دەچەماندەوە، ـ گوایە خوایەکەی بەرامبەریەتی ـ بەڵام ئەوەی سەیربوو، مانگاکە لەناکاو ڕووی لە دوکانێکی سەوزە کرد، خاوەن دوکانەکە بە خێرایی لە دوکانەکەی هاتە دەرەوەو هەردوو دەستەکانی لە نێو چاوی خۆی داناو خۆی بۆ چەماندەوە، مانگاکە چووە ناو دوکانەکەو ئەوەی خوادی ئەوەی تری پەرش وبڵاو کردو بەقاچەکانی هەمووی شێلا، دواییش بە ئەو پەڕی ویست و مەبەستی خۆی لە دوکانەکە هاتە

دەرو بەدەم پیسایی بەردانەوە ڕۆیشت! لەمەش سەیرتر خەڵکەکە هەر یەکەو پلێکی لە پیسایییەکەی دەداو لەنێوچاوانی خۆی هەڵدەسوو!

دەزانن لەمەش سەیرو سەمەرەترو چ بوو! گەڕاینەوە هوتێلەکەمان شەو نوستین بەیانیەکی زوو لەگەڵ دەنگە دەنگێکی زۆر بەئاگا هاتین کاتێ لە پەنجەرەی ژوورەکەمانەوە سەیری خوارەوەمان کرد، بینیمان دارمردوویەکی گەورە لەسەر شانی خەڵکانێکە مردوویەکی لەسەرە و لە تەك مردووەکەش ئافرەتێك بە زیندوویی داندراوە، پرسیارم کرد ووتم ئەمە چی یە؟ ووتیان ئەمە کەسێکە مردووە دەیبەن دەیسوتێنن، ووتم ئەی ئەم ئافرەتە چی یە لە تەنیشتی داندراوە؟ ووتیان خەڵکێکی ئەم ووڵاتە داب و نەریتیان وایە کاتێ ئافرەتێك پیاوەکەی دەمرێت ئافرەتەکەش لەگەڵ ئەو دەسوتێنن!

دەبینن خەڵکانێك چۆن دەژین؟ لەگەڵ ئەوەی خاوەنی زانست و زانیارین، وەکو ئێمەش مرۆڤن و خاوەنی عەقل و چاوو کوێن بەڵام ڕێگای ڕاستەقینەی ئایینیان بزر کردووە خودای گەورەش دەربارەیان دەفەرمووێت: ﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا ۚ أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ﴾ {سورەتی الأعراف: ئایەتی ١٧٩} واتە: (سوێند بەخوا بێگومان ئێمە زۆر لە پەری و ئادەمیزادمان بۆ دۆزەخ دروست کردووە، ئەوانە دەزگای دڵیان هەیەو کەچی حەقی پێ تێناگەن، چاویشیان هەیە کەچی حەقی پێ نابینن، گوێیان هەیە کەچی حەقی پێ نابیستن، ئائەوانە وەکو ئاژەڵ وان(لەشوێنکەوتنی ئارەزوودا) بەڵکو ئەوانە وێڵ تریشن، ئا ئەوانە هەر غافڵ و بێ ئاگان لە حەق)

﴿ أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ۚ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ ۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴾

{سورەتی الفرقان: ئایەتی٤٤} واتە: (ئایا وادەزانیت زۆربەی ئەوانە ڕاستیەکان دەبیستن، یابیرو هۆشیان دەخەنە کار؟ ئەوان ماڵات نەبێت هیچی تر نین، بەڵکو گومڕاتریشن لە ماڵات).

کەوابوو دەبا سەجدەیەکی سوپاسگوزاری بۆ خودای خاوەن نیعمەتەکان ببەین و، بزانین ئێمە لەناو چ نیعمەتێکی گەورەی خودای میهرەبانین و هەستیشی پێ ناکەین.

بزانە گەورەترین نیعمەت و بەخشش ئیمان و ئیسلامە.

ئایا دەزانی ئەگەر ئەو ئاین و ئیسلامەمان نەبوایە، ژن و ژنخوازیش نەدەبوو، ئەو کات مام و خاڵ برازاو پوورو پوورزا نەدەبوو.

دەزانی ئەگەر ئەو ئایینە پیرۆزەمان نەبوایە خێزان و خانەوادەو ماڵ و منداڵیش نەدەبوو.

موسڵمانێك رۆژێك هاتە لام ووتی: مامۆستا خزمێکم لە دەرەوە هاتۆتەوە ئافرەتێکی لەگەڵ خۆی هێناوەتەوە، سێ ساڵە لەگەڵیەتی بەڵام تا ئێستا مارەی نەبریوە! منیش پێیم ووت: با بچێت لای مامۆستایەك مارەی ببڕێت، ووتی: بەڵام کێشەیەکی هەیە، ووتم: چی یە؟ ووتی: منداڵێکی لەو ئافرەتە هەیە نازانێت چ لەو منداڵە بکات!

منداڵێکی ساوای بێ گوناهو تاوان دەبێتە سووتەمەنی ئاگری ئارەزووبازی دوو کەسی نەفام، کاتێ کە تەنها یەك فەرمانی خودای گەورە پێشێل دەکرێت و پشت کوێ دەخرێت.

کەوابوو ئاین ژیانە، بەڵام کوفرو تاوان ژانە، خواناسی خۆ ناسی یە، ئیمان و بڕوا دڵنەوایی و ئارامی یە، بەهاو رێزی مرۆڤ لەئیسلامدایە.

## هەڵوەستەیەك:

براو خوشکی سەنگین:

* بزانە کەسایەتی وپایەداری بە زانست و زانیاری نیە، بەڵکو بەدەست گرتنە بەئاین.

* فەزل و گەورەیی پێغەمبەری خۆشەویست و(ﷺ) هاوەڵانیت لەبەر چاو بێت، بەرامبەر رەنج و تێکۆشانیان بۆ گەیاندنی ئەو ئایینە بەئێمە.

* بیر بکەوە لە سستی و خاوی خۆت بۆ گەیاندنی ئەو نیعمەتەی کە خودای گەورە لەگەڵی کردووی تا چەند هەوڵت داوە بە خەڵکانی تری بگەینی.

* خوشکی گەورەم سەیرکەو سەرنج بدە هەر چی ئایینی دەسکردو ئایدۆلۆژیاو بیرۆکە هەیە لە کۆن و نویٚ نەی توانیوە وەك ئایینی پیرۆزی ئیسلام پلەو پایەو ریٚزی ئافرەت دیار بکات.

* برای گەنج و لاو: بەراستی مخابنە خاوەنی ئەو ئایینە بەرزو پیرۆزە بین، خاوەنی بڕوانامەو زانست و زانیاری بین، بەلاّم وەك پێویست شارەزا نەبووین لە ئایینە پاك و بێگەردەکەی خۆمان، تا ئێستا قورئانت خەتم نەکردبێت، شتێکت نەخوێندبێتەوە دەربارەی ئایینەکەت.

لە کۆتاییدا دەلێم:

ژیان ـ بڕوا (ئیمان) = نەمانی بەهای مرۆڤی

مرۆڤ ـ بەرنامەی ئیسلام = سەرگەردانی

مرۆڤ ـ خودا پەرستی = ڕسوا بوون بە(پەرستنی شتێکی نزمتر لەمرۆڤ)

ئافرەت ـ بەرنامەی خودا= بەکار هێنانی وەك کالاّ

ژیانی ڕاستەقینەش ئەوەیە: کە مرۆڤ دۆست وخۆشەویستی تەنها خودای گەورە بێت:

خۆزگە تۆم لەلا شیرین دەبوو با ژیانیش تالّ با

خۆزگە تۆ لیٚم رازی دەبووی با هەموو خەلّك زویر بان

خۆزگە نێوانی من و تۆ ئاوەدان دەبوو

با نێوان من و هەموو خەلّکان وێران با

ئەگەر خۆشەویستی تۆم هەبیٚ هەموو شتێك سانایە

هەموو ئەوەی لەسەر زەویە هەر لە خۆلّە

* بەرنامەت لەو ڕەمەزانە پیرۆزەدا: دوای نوێژی (عەسر) تا پێش ڕۆژئاوا:

١ـ بەشداری ووتاری دوای نوێژی (عەسر) بە.

٢ـ بازنەیەکی قورئان خوێندنی بەکۆمەلّ ڕێك بخەن تێیدا بەشدار بە.

٣ـ وانەیەکی شەرعی بخوێنە.

٤ـ جوزئێك قورئان بخوێنە.

٥ـ کیتابێکی (زوهد) باسی (لەخواترسان) بخوێنەوە.

٦ـ ئەو ماوەی لەمزگەوت دەمینێیتەوە نیەتی (ئیعتیکاف) بێنە.

## بڕیاری گۆڕانکاری بدە:

ئەگەر کەم و کورتی و کەمتەرخەمیت هەیە بەرامبەر دایك و باوکت داوای گەردەن ئازادیان لێ بکەو، بەڵێنی چاکەکردن بدە لەگەڵیان ئەگەر ماون، ئەگەر نەشماون دوعای چاك و خێرو چاکەیان بۆبکە.

# خەڵاتی حەوتەم

## بەخشین باشترین چارەسەرە بۆ نەخۆشانی بێ هیوا

ڕۆژووەوانانی مانگی پڕ لەخێرو میهرەبانی: لەو سەردەمەی ئێستادا نەخۆشی و دەردو کارەسات گەلێك زۆرە، زۆربەی دەردو نەخۆشیەکانیش زۆر گران و پزیشك و پسپۆڕان سەرەدەری لێ دەرناکەن و نەخۆشان لەڕەحمەت دەرگای ئاسمان هیچ ڕێگاو هیوایەکی تریان نەماوە.

زۆرجار لەدانیشتن کۆڕو گفتوگۆی ناو خەڵك باس لەو هەموو نەخۆشی و دەردو کارەساتانە دەکرێت و لێکدانەوەی جۆراو جۆریان بۆ دەکرێت بەڵام ئەگەر بە پێوەرو بۆچوونی موسڵمانانە لێکدانەوەی بۆ بکرێت دەبینین چاکترین هۆکارو دەرەنجامان بەدەست دەکەوێت، ئەمەش نەوەك بەبیرو بۆچوون و لێکدانەوەی خۆمان بەڵکو پێغەمبەری خۆشەویستمان () دەفەرمووێت: ((كيف أنتم إذا وقعت فيكم خمس وأعوذ بالله أن تكون فيكم أو تدركوهن: ما ظهرت الفاحشة في قوم قط فعمل بها بينهم علانية إلا ظهر فيهم الطاعون والأوجاع التي لم تكن في أسلافهم، وما منع قوم الزكاة إلا منعوا القطر من السماء، ولولا البهائم لم يمطروا، وما بخس قوم المكيال والميزان إلا أخذوا بالسنين وشدة المؤنة وجور السلطان عليهم، ولا حكم أمراؤهم بغير ما أنزل إلا سلط الله عليهم عدوهم فاستنقذوا بعض ما في أيديهم، وما عطلوا كتاب الله وسنة رسوله إلا جعل الله بأسهم بينهم)) {تەبەرانی گێڕاویەتیەوە} واتە: ((بارودۆخی ئێوە چۆن کاتێ پێنج شت لەناوتان بڵاو ببێتەوە پەنا دەگرم بەخودای گەورە لەوشتانەو بڵاوبوونەوەیان: بەد ڕەوشتی و کاری بەد لەناو هەر نەتەوەو چینێك بڵا ببێتەوە بەئاشکرایی ئەنجامی بدەن ئیللا خودای گەورە تووشی تاعون و پەتاو نەخۆشی و ئەوتۆیان دەکات کەلەناو باب و باپیرو پێشینەکانیاندا نەبووە، هیچ نەتەوەو چینێك زەکاتیان وازلێنەهێناوە ئیللا خودای گەورە بارانی ئاسمانیان لێ دەبڕێت، ئەگەر لەبەر ئاژەڵەکانیان نەبا هەرگیز بارانیان بۆ نەدەباری، هیچ نەتەوەو چینێك فێڵیان لەپێوانەو تەرازوو نەکردووە ئیللا خودای گەورە تووشی

گرانــی و بــژێوی ســەخت و ناخۆشــی و ســتەمی کاربەدەســتانیان دەکــات، وە هــەر کــاتێ کاربەدەستەکانیان حوکم و فرمانڕەوایی بە قورئان نەکـەن ئـیللا خـودای گـەورە دوژمنانیــان بەسەردا زاڵ دەکات، بەهەوڵ و کۆششێکی زۆر هەندێ شـتیان لەدەسـت دەردێـنن، وە هـیچ نەتەوەو چینێك وازیان لە قورئان و و فەرموودەی پێغەمبەر نـەهێناوە ئـیللا خـودای گـەورە کێشەو دووبەرەکیان دەخاتە نێوان)

براو خوشکی موسڵمانی سەنگین: ئـەوە زانیمـان هـۆی ئـەو هـەموو نەخۆشـی و دەردوو کارەساتانە چی یە؟

دەفەرموون با بەیەکەوە بچینە دەرمانخانـەی قورئــان و ســوونەتی پێغەمبــەری خـودای گەورە(ﷺ)، وەك دەفەرمووێ: ((داووا مرضاکم بالـصدقة وحـصنوا أمـوالکم بالزکـاة وأعـدوا للبلاء الدعاء)) {بەیهەقی گێڕاویەتیەوە لە (شعب الإیمان)} واتە: (چارەسەری نەخۆشیەکانتان بکەن بە ماڵ بەخشین، وە ماڵ و سامانەکانتان بپارێزن بەزەکات بەخشین، وە بە پاڕانەوەو دوعاکانتــان بەر لەکارەسات و ناخۆشیەکان بگرن).

**ئێستاش فەرموون لەگەڵ ئەو ڕووداوو بەسەرهاتە ڕاستەقینەیە:**

پیاوێکی دەوڵەمەندو زەگینی خـەڵکی شـاری سـولەیمانی لەسـاڵی نەوەدەکانـدا تووشـی نەخۆشیەکی کوشندە بوو، بۆ چارەسەری دەچێتە بەغدا کەلەو کات و ساتەدا ڕێگـای چـوونە بەغدا زۆر ناخۆش و سەخت بوو، دەبا بـەلۆری و گەڵابـە لەسـنووری بازگـەکانی کوردسـتان بپەریتەوە بۆ ناو شارەکانی باشوور، بەڵام بەهەر شـێوەو شـێوازێك بـوو چـووە بەغـدا، دوای پشکنین پزیشك پێی دەڵێت: چەند دەمارێکی دڵت گیراوەو پێویستیت بە نەشتەرگەری هەیـەو تەندروستیشت نالەبارە، بەڵام لەبەر ئەوەی کەسی لەگەڵدا نیە، بۆیە دەڵێت تا نەگەڕێمەوە بۆ ماڵ ناتوانم ئەو نەشتەرگەریە ئەنجام بدەم، زۆر بە دڵێکی تەنگ و ناخۆشەوە دەگەڕێتەوە ماڵ، ئەنجامی نەخۆشیەکەی بەمنداڵ خێزانەکەی ڕادەگەیەنێت، چـەند ڕۆژێـك غـەم و پـەژارە دای دەگرێت و لەماڵ گۆشەگیر دەبێت، دوایی خێزانەکەی تەکانی لێیداو هانیـدا کـە بـچێتە دەرو ئاوو هەوایەك بگۆڕێت، پێی ووت: پیاوەکە بڕۆ بـازارو چـەند کیلـۆ گۆشـتێکمان بـۆ بکـڕە،

پیاوەکەش وورده وورده بەرەو دوکانی دۆستە گۆشتفرۆشەکەی دەچێت، دوای باسکردنی بەسەرهات و نەخۆشیەکەی و پشوویەك، ئەو پیاوە نەخۆشە ئافرەتێك دەبینێت لەبەردەم دوکانەکە لەگەڵ یەك دوو منداڵی بچووکی لەناو زبڵدانەکان و بەزو چەرمە فڕێ دراوەکانی بەردەم دوکانی گۆشت فرۆشەکەی بە چەقۆیەك دەڕنیەوەو لەناو زەرفێکی دەکرد، پرسیاری لەگۆشت فرۆشەکەی دۆستی کردو پێی ووت: ئەم ئافرەتە ئەم پیسییەی بۆچی یەو؟ بۆچی وادەکات؟ گۆشت فرۆشەکەش ووتی: ئەم ئافرەتە ئافرەتێکی هەژارەو خاوەنی چەند هەتیوێکەو پیاوی نەماوە ماوەیەکی دوورو درێژە لەبەردەم ئەم دوکانانە هەرچی پاشماوەو ئەوشتانەی ئێمە فڕێی دەدەین ئەویش هەڵی دەگرێتەوەو دەیباتەوە ماڵ و بۆ منداڵەکانی دەیکات بە چێشت و بەم شێوەیە دەژیت، ئەم پیاوە نەخۆشە زۆر دڵی بۆی سووتاو بانگی کردوو بڕی (١٠٠٠) هەزار دیناری کۆنی سویسری پێیداو دوایی بەگۆشت فرۆشەکەی ووت (٣) سێ کیلۆ گۆشتی باشی بۆ بکێشەو پێی بدە، ئینجا بەم ئافرەتە داماوە دایکە هەتیوەی ووت: خوشکی خۆم هەموو مانگێك تۆ دێیتە لای ئەم گۆشت فرۆشە مانگانەی خۆت وەربگرەو هەر پێویستیەکیشت هەبوو من وەك برایەکی خۆت سەیر بکە، ئەم ئافرەتە لەخۆشیان نەی دەزانی چ بڵێت چۆن چۆنی چاکەی بداتەوە، هەردوو دەستەکانی بڵند کردوو بەچاوە پڕ لەفرمێسکەکانیەوە دەستی بەدوعاو نزاکردن کرد، ئەم پیاوە دەڵێت: ئەوەندەم زانی تەزوویەك بەهەموو لەشم داهات و هەموو گیانم بووە ئارەقە، هەر ئەو کات هەستم بە دڵخۆشی و لەش سووکیەکی زۆر کردو هەستم هەناسەم خۆشتربووە، هیچ ئێش و ئازارێکم نەما، دوای ئەو ماوەی کە پزیشکەکەم بۆی دیار کردبووم چوومەوە بەغدا بۆ نەشتەرگەری کاتێ پزیشکەکە سەیری ڕاپۆرتەکانی کردوو ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی سەیر کردوو جارێکی تر پشکنینی بۆم ئەنجام داوە.

ووتی: بەڕاستی تۆ نەخۆشەکەی؟!

ووتم: بەڵێ.

ووتی: نازانم بڕوا بکەم یان نا!

ووتم: بۆ دوکتۆری بەرێز

ووتی: پێم نالێی چیت کردووەو؟ چ دەرمان و چارەسەریەکت بەکار هێناوە؟

ووتم: (واللە) دوکتۆری بەرێز لەو کاتەی لای تۆ گەراومەتەوە هیچ شتێکم بەکار نەهێناوەو تەنها چاوەروانی بریارو نەشتەرگەریەکەی بەرێزت بوویمە.

ووتی: بەگوێرەی ئەو پشکنین و ئەنجامی تاقیکردنەوانەی ئێستاو ئەم جارە ئەوەی نەخۆشی بێت لەلەشی تۆو لەدلتدا نەماوە! دەبێ شتێکت کرد بێت!

دەلێت منیش وتم: (واللە) دوکتۆری بۆرێز تەنها یەك شتم کردووە ئەویش ئەوەیە رۆژێك یارمەتی ئافرەتێکی هەژارو خاوەن هەتیومدا ئەو ئافرەتە دوعاو نزایەکی زۆری بۆم کردوو هەستم بە گۆرانکاریەکی زۆر کرد

پزیشکەکە ووتی: دە وا بلێ مالّ بەخشینەکەت بووەتە پزیشك و چارەسەر بۆ تۆ.

ئەی ئەو کەسانەی بەدەست نەخۆشی و دەردەوە دەنالێنن دەردی هەژاری و نەداریش لە دەردی ئێوە کەمترنیە، چارەسەری دلّ شکاوان بکەن لە ئافرەتانی بێوە پیاوو مندالانی بێ باوك و کرێچی و قەرزارو ئەوانەی کوێرن و شەلن و ئیفلیجن خودای بەهانای تۆش دێت .

پیاوێکی نزیك لەو گەرەکەی خۆمان کەچەند مانگێك لەمەوبەر وەفاتی کرد بەناوی (مام ئیسماعیل) تووشی نەخۆشی شەکرەیەکی زۆر کوشندە ببوو بە شێوەیەکی ئەوتۆ پزیشك و پسپۆرانیش سەریا لێ سورمابوو لەناکاو رێژەی شەکرەکەی دادەبەزی بۆ پلەیەکی زۆر نزم، یا لەناکاو بەرزدەبۆوە بۆ پلەیەکی زۆر بەرزی مەترسیدار، پیاوێکی هەژارو دیندارو خواناس بوو زۆر لەئێش و ئازاردا بوو دەلێت: شەوێك لە خەودا دوو هاتنە ژوورەوەو هاتنە نزیکم سینگیان لەت کردم و نەشتەرگەریەکیان بۆم کردو دوای ئەم خەونە هەرگیز تووشی نەخۆشی شەکرە نەبۆوە.

کەوابوو ببەخشە تا لەش ساغ بیت.

پزیشکێکی یەکێ لە وولاتانی کەنداو لەیەکێ لەتۆرەکانی ئەنتەرنێت باسی رووداوێکی زۆر سەیری خۆی دەکات دەلێت مندالێکی ئیفلیجی دەبێت کەهەر لەزکماکەوە ئیفلیج بووە،

دوای ئەوەی چەندین پزیشك و وولاَتی جیهانیان پێی کرد بێ سوودو چارەسەر بوو تاگەیشتنە ئەو ڕایەی کە هیچ چارەسەریەکی نیە دەڵێت: لەگەڵ دایکی بە نۆرە بەخێومان دەکرد، دایکی بەیانیان دایکی دەچووە دەوام من لەماڵ چاودێریم دەکرد ئێورانیش من دەچوومە دەوام دایکی چاودێری دەکرد، بەڕاستی بەهۆی ئەو منداڵەوە ژیانمان زۆر سەخت و ناخۆش ببوو، لەزۆر شت بێ بەش ببووین، ڕۆژێك چوومە (عیادە)کەم ئافرەتێك منداڵێکی لەسەر دەستی بوو هاتە ژوورەوەو کاتێ پشکنینم بۆی ئەنجامدا پێویستی بەنەشتەرگەری بوو بەدایکەکەم ووت: منداڵەکەت پێویستی بەنەشتەرگەر هەیە نەشتەرگەریەکەشی پارەیەکی زۆری تێدەچوو کاتێ دایکەکە ئەمەی بیست بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە ڕووی لێم کردوو ووتی: دوکتۆری بەرێز (واللە) خێزانێکی هەژارین و ئەو پارەیەی تۆ دەیڵێیت نیتمان یادەبێت چاوەڕێی مردنی ئەوجگەر گۆشەیەم بکەم تا بەم ئازارەوە دەتلێتەوەو دەمرێت یا دەبێت یارمەتیم بدەیت نەشتەرگەریەکەی بۆ بکەیت کاتێ گوێ بیستی ئەمە بووم منداڵە ئیفلیجەکەی خۆم هاتە بەرچاو بۆیە هەر ئەو کات ووتم: بیبە ژووری نەشتەرگەری هەر ئێستا نەشتەرگەریەکەی بۆ ئەنجام دەدەم بەخۆڕایی دایکەکە لەخۆشیا فرمێسك بەچاوەکانیدا هاتە خوارو دەستی بەدوعاو نزاکردن کردو تا لەنەشتەرگەریەکە بوومەوەو هاتمە دەرەوە بینیم هەر دوعای خێرم بۆ دەکات درەنگانێکی شەو گەڕامەوە ماڵ بەڵام ئەوەی لەبیرو ئەندێشەم بوو چاوەڕوان نەدەکرا بەچاوی خۆم بینیم کە لەدەرگامدا بینیم ئەو جگەرگۆشەی چەندین ساڵە لەسەر پشت کەوتووەو لەژیانی خۆی لەسەر پێیەکانی ڕانەوەستاوە هاتووە دەرگام لێ دەکاتەوە نەم دەزانی چی بڵێم و چۆن باوەڕ بەخۆم بکەم؟! دەبینم دێت ودەچێت قسەش دەکات نەم دەزانی چۆن خۆشحاڵی خۆم دەربڕم بەو ڕۆژە مێژوویی و خۆشە بۆیە باوەشم لێیداو من و ئەو هەردووکمان ماوەیەك دەگریان ماوەیەك پێدەکەنین، کاتێ دایکی هاتە حەوشەکەو ئەمەی بینی زۆری نەمابوو تووشی شۆك بێت، ئەو شەوە بۆ ئێمە بووە ڕووناکترین شەوو خۆشترین شەوی ژیانمان.

تا خودای گەورە بەهانات بێت بەهانای خەڵکان وەرە.

تا لەڕۆژی ڕەش و تەنگانە دڵخۆش بیت دڵی خەڵکان خۆش بکە.

تا ماڵت پارێزراو بیت زەکات ببەخشە.

ڕێنمایی بۆ خاوەن ماڵ و دەوڵەمەندانی ئوممەتی پێغەمبەری سەروەر(ﷺ):

١ـ زۆر بەووردی بەباشی ماڵەکەت (جەرد) لێك بدەوە، بەتایبەت کەل و پەلی بازرگانی و دوکان زۆر ووردبەو ئاگاداربە.

٢ـ بڕۆ خزمەت مامۆستایەکی ئایینی زۆر بەووردی پرسیاری لێ بکە.

٣ـ تا بکرێت بەدەستی خۆت ماڵەکەت ببەخشە خێری زیاترە، مەگەر خۆت نەتوانی بیگەینیت بەکەسانی پێویست.

٤ـ ئەو بڕە ماڵەی دەیبەخشی بەش بەشی مەکە، بەڵکو دوای لێکۆڵینەوەو پرسیار کردن کەبڕی پێویستیەکەت زانی بڕێکی ئەتۆی پێ بدە کەپشتی ڕاست بکەیتەوە، نەوەك دڵی بە خۆی بسووتێت.

٥ـ ئەوانەی ئیش و کارو کاسبیان پێ دەکرێت کەل و پەلی ئیش کردنیان بۆ بکرێت و بەئیش بخرێن، بۆنموونە زۆر ئافرەتی خاوەن یەتیم و بێ پیاو مەکینەی دوورمانیان بۆ بکردرێت و فێری دوورمان بکرێن، یا چەند (عارەبان) یا (ماتۆڕێك) بکڕدرێت بۆ ئەو پیاوانەی بێ ئیش و کارن ئیشی پێ بکەن، یا خود کرێچیەك ڕزگار بکەیت لەدەردی کرێچیەتی.

٦ـ ئەو هەژارو نەدارانەی بەرژەوەندی خۆیان نازانن دەکرێت مانگانەیەکیان بۆ ببڕیتەوە، پارەکە بدەیتە کەسێکی دڵسۆز بە گوێرەی پێویستیان بۆیان خەرج بکات.

٧ـ زەکات و سەرفیترەو هەر خێرێکی تر بە(مەلا) و ( ئافرەتی بێ پیاو) و (هەتیو) ناچێت ئەگەر دەوڵەمەند بوون، بەڵام ئەگەر ئەمانە هەژار بوون ئینجا هەروەك خەڵکێکی ئاسایی پێیان دەچێت.

٨ـ چاکترین خێرو ماڵبەخشین ئەوەیە بەنزیکترین کەس لە خزم و کەس و دۆستان دەست پێ بکەیت.

# خەلاتی هەشتەم

## منداڵێکی بچوك دەبێتە ڕێنموونی کاری باوکی

مامۆستایەکی زۆر بەڕێز کە مامۆستای قۆناغی ئامادەیی بوو خۆی بۆی گێرامەوەو ووتی: من کەسێکی بێ بڕواو بێ دین بووم، کە هەر بڕوام بە بوونی خودای گەورە نەبوو، بەڵام خودای گەورەو میهرەبان منداڵێکی چاوگەش و خنجیلانەی پێ بەخشیم، بەڵام ئەو منداڵە وەك منداڵێکی ئاسایی نەبوو، زۆر زرنگ و زیرەك و ووریاو قسەزان وەك بلێی خودای کاربەجێ بە تایبەت بۆ منی ناردبێت، کاتێ چوار پێنج ساڵان بوو، یەکەمین پەندو ئامۆژگاری کردم، ئەویش سەر لە ئێوارەیەکی مانگی ڕەمەزانێك لە ڕەمەزانەکانی ساڵی نەوەدەکاندا هەورە تریشقەو بروسك و دەنگی گەواڵەیەکی زۆر گەورەو نا ئاسایی پەیدابوو، ئەو منداڵەی من زۆر زۆر دەترساو دەهات و دەچوو ئۆقرەی لێ هەلگیرابوو، بەدەم گریان و زیڕانەوە دەهاتە باوەشم و دەی باوکە بۆ نوێژ ناکەی منیش پێیم دەوت: مەترسە چ نیە، کاتێ لای منیش نەدەما بە هەڵەداوان دەچۆوە لای باپیرەی خۆی لە باوەشی دەنا، دوای ماوەیەك جارێکی تر دەهاتەوە لای من هەمان قسەی پێشووی دووبارە دەکردەوە، منیش پێیم ڕۆڵە نوێژ چ پەیوەندیەکی بە هەورە تریشقەوە هەیە!

بۆیە بە چاوی فرمێسك و هەنسکەوە ووتی: ئەی نابینی ئەوەی سەر بە حیزبێك بێت کەس لێ نادات؟! تۆش ئەگەر نوێژ بکەیت دەبیتە عایدی خودای گەورە، خودای گەورەش لێمان نادات!

بەڕاستی ئەو قسەیە لە مێشکم چەقی و کاری تێکردم، بەڵام بە هۆی پەردە ئەستورەکانی دڵم نەی توانی پەڕەکانی دڵم کون بکات و کاری تێ بکات و گۆڕانکاری دروست بکات بم گۆڕێت.

پەندو ئامۆژگاری دووەمی ئەو منداڵە بۆ من: شەوێك لە شەوەکانی هاوین لە سەر بان خەریکبوو بنوین، ئەو منداڵەش لە باوەشم سەری بە قۆڵم کردبوو.

لەناکاو پرسیاری کردو ووتی: بابە گیان ئەو شتانە چی یە لەئاسمان؟

منیش ووتم: رۆڵە گیان ئەوە ئەستێرەیە.

پاشان ووتی: بابە گیان ئەو ئەستێرانە لێمان دوورن یا نزیکن؟

ووتم رۆڵە گیان: ئەوانە زۆر دوورن.

ووتی: ئەی گەورەن یا بچوکن؟

ووتم بابە گیان: زۆر گەورەن، هەر یەکێکیان چەندین جار بە قەد زەویە.

پاشان پرسیاری کردو ووتی: ئەی بۆ چی ئەوەندە بچوك دیارن؟

ووتم: چونکە لێمان دوورن هەر شتێکی گەورەش ئەگەر دوور بێت بچوك دەبێتەوە.

ئەو منداڵە هەر بۆ خۆی ووتی وەکی تەیارە کە نزیك دەبێت گەورە دیارە، بەڵام کە بەرز دەبێتەوە بچوك دەبێتەوە.

دوای ئەو هەموو پرسیارەی، پرسیارێکی تری کرد کە هەموو ژیانمی گۆڕی، بە هیچ شێوەیەك نەدەکرا وەڵامەکەی پەردەپۆش بکرێت و خۆمی لێ بدزمەوە، ئەویش ئەوە بوو ووتی: بابە گیان ئەی کێ ئەو ئەستێرانەی دروست کردووە؟

خۆم بێ دەنگ کردو وەڵامم نەدایەوە جارێکی تر پرسیارەکەی دووبارە کردەوە، منیش بە بێ بێزاریەوە ووتم: کەسێکە پێی دەڵێن خوا.(هەر چەندە من بروام بە وەڵامە نەبوو، بەڵام بەناچاری ئەو وەڵامەم دایەوەو، خۆشم نەم دەزانی چۆن ئەم وەڵامەم بەسەر زاری داهات)

ئەم جارەیان پرسیارێکی ئەو تۆی کرد، کە هیچ گومانم نەما لەوەی کە ئەو منداڵە بە پاکی و بێگەردی خۆی دەیەوێت رێگای ڕاستم پێ نیشان بدات و، دەستم دەگرێت بەرەو ڕاستی ڕاستبوون، پرسیارەکەی ئەم جارەی ئەوە بوو ووتی: بابە گیان ئەو خوایەی ئەو ئەستێرانەی دروست کردووە، خودایەکی گەورەیە یا بچوکە؟

ئەم جارەیان نەم ویست وەڵامی بدەمەوەو، ویستم خۆم لە وەڵامەکەی بدزمەوە فەرامۆشم کرد، بەڵام خۆی پێشم کەوت و وەڵامەکەی دایەوەو ووتی: ئا دەبێت ئەو خودایە زۆر گەورە بێت، چونکە ئەگەر گەورە نەبێت ناتوانێت شتی گەورە دروست بکات!

ئەو شەوە تا درەنگانێکی شەو بەو پرسیارانە لە مێشك و ئەندێشەم دەخولانەوەو بیرم لێیان دەکردەوە، ئەوە بوو وەڵامەکانیان بۆ من بوونە کلیلی دەرگای حەق و ڕاستی و ژیانی ڕاستەقینە، ئەو برایە دۆستێکی زۆر نزیکی بەندە بوو مامۆستایەکی ڕێك و پێك و تا بڵێی موسڵمانێکی دەسگرتوو دیندارو خواناس، زۆربەی نوێژەکانی بە کۆمەڵ ئەنجام دەدا، بە کوێرەی تواناو زانیاری خۆی ئامۆژگاری موسڵمانانی دەکرد، ئەو چیرۆك و بەسەرهاتەم لە زاری خۆیەوە وەرگرتووە، بەڵام چەند ساڵێك لەمەوبەر بەخۆی و برایەکی لە ڕێگای هەولێر کۆیە بە ڕووداوی هاتووچۆ کۆچی دوایی کرد.

دەفەرموون بەیەکەوە لە سەر سفرەی ئەو بەسەر هاتەوە باسی فەزل و میرەبانی خودای گەورە بکەین لەگەڵ بەندەکانی.

برای خۆشەویست: بزانە ئەو مانگە پیرۆزە وەرزی تۆبەو پەشیمان بوونەوەیە، کەوابوو لەگەڵم بە دامەبڕێ:

* بە تۆبە کردن موسڵمان دەبێتە خۆشەویستی خودای گەورە، وەك دەفەرمووێ:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴾ {سورەتی البقرە: ئایەتی٢٢٢}

* تۆبە کردن هۆکاری بەختەوەری دونیاو دوارۆژە: ﴿ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ {سورەتی النور: ئایەتی٣١} واتە:(کەواتە هەمووتان ئەی ئیمانداران بەرەو لای خواو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی رزگارو سەرفراز بن)

* بەتۆبە هەرچی گوناهو تاوان هەیە ڕەش دەکاتەوە، جگە لە مافی خەڵکان نەبێت، وەك خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾ {سورەتی التحریم: ئایەتی٨} واتە:(ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، ئێوە بە تەوبەو پەشیمانیەکی پوخت و

دڵسۆزانە ڕوو بکەنە خوا، نزیکە پەروەردگاتان لە هەڵەو گوناهەکانتان خۆش ببێـت بتانخاتـە باخەکانی بەهەشتەوە کەچەندەها ڕووبار بەژێر درەخت و کۆشکەکانیاندا دەڕوات ....)

پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێ: ((التائب من الذنب كمن لا ذنب له)) واتە: (ئـەوەی تۆبەو پەشیمان دەبێتەوە لە گوناهەکانی وەك ئەوەیە هیچ گوناهو تاوانی نەکردبێت)

* هەر ئەوەندەش بەڵکو هەر چی گوناهو تاوان و خراپەکاری هەیە خودای میهرەبان بۆت هەڵدەگێرێتەوە بە چاکە وخێر خودای بەخشندە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ {سورەتی الفرقان: ئایەتی٦٨ـ٧٠} واتە: (هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە خوایەکی تر لەگەڵ خوادا ناپەرستن، کەسیش ناکوژن کە خوا کوشتنی حەرام کردبێتمەگەر بە حەق و ڕەوا، هەروەها زینا ناکەن و نزیکی ناکەون، جا ئەوەی ئەو جۆرە کارە خراپانە ئەنجام بدات، ئەوە تووشی سزاو ئازارو ڕیسوایی دەبێت * لە قیامەتیشدا سزاو ئازاری بۆ چەند بەرابەر دەکرێت بەزەلیلی و خەجاڵەتی و شەرمەزارییەوە دەبێت ژیانی تێدا بەرێتە سەر * مەگەر ئەو کەسەی کە تەوبە بکات و باوەڕ بهێنێت و کارو کردەوەی چاکە ئەنجام بدات، ئا ئەو جۆرە کەسانە خوا کارو کردەوە خراپەکانیشیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە چونکە هەمیشەو بەردەوام خوا لێخۆشبوو میهرەبانە(بەرامبەر خەڵکی بەگشتی و ئەو جۆرە کەسانە بەتایبەتی))

* تەوبە هۆکارێکە بۆ زیادبوونی رزق و ڕۆزی و خۆشگوزاری و بارانی ڕەحمـەت و هێـزو توانایی و بەخشینی منداڵی چاك و باش: ﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا ﴾ {سـورەتی نـوح: ئایەتی ١٠ـ١٢} واتە: (بەردەوام پێم دەگوتن: ئێوە داوای لێخۆشـبوون لـە پـەروەدگارتان بکـەن

چونکە بەڕاستی ئەو زاتێکی لێخۆشبووە * بارانتان بەلێزمە و خوڕەم بۆ دەبارێنێت * ماڵ و سامان و نەوەتان پێ دەبەخشێت، هاوڕێ لەگەڵ باخ و باخاتدا، ڕوبارو چەم و جۆگەتان بۆ بەدی دەهێنێت ).

براو خوشکی گەنج و لاو: تۆبەی قۆناغی گەنجیت بە هەل بزانەو ئەو پلەو پایە بەرزو پڕ لە شکۆیە لە دەست مەدە، کە نزیك بوونەوەو گەیشتنە ئاستی فریشتە پاك و بێگەردەکانی خودای کابەجێ یە، وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێ: خودای گەورە دەفەرمووێ: ((أیها الشاب التائب ـ لە ریوایەتیکی تر ـ التارك شهوته من أجلي أنت عندي أفضل من بعض ملائكتي)) واتە: (ئەی گەنج و لاو تۆبەکار ـ کە ئارەزوو بازیت واز لێهێناوە لە پێناوی من تۆ لای من لە هەندێ لە فریشتەکانی من بەرێزتری)

خەڵکانێك بە هەڵە لە تەوبەو گەڕانەوە بۆ خودای تێگەیشتوون، کەوابوو ئاگاداری ئەم خاڵانە بە:

تەوبە کردن دوا مەخە، ئەگینا دوات دەخا کوێ بگرە لە ڕووداوە کە لە گوندێکی دەورو بەری هەولێر ڕوویدا بەر لە ساڵێك، کە خۆم چوومە تازیەکەی:

گەنجێکی کرێکار بەیانیەکی زوو لەگەڵ هاوڕێیەکانی سواری ئۆتۆمبێل بوو، بەڵام هەر کە سوار بوو ووتی: ئەم شەو خەونێکی زۆر سەیرم بینی، کەسێکی بەرگ سپی نوورانی هاتە لام و پێی ووتم: ئەی کوڕە گەنج تا کەی نوێژ ناکەی؟! نوێژەکانت دەست پێ بکە. ئەو بەیانی یە پێ ڕانەگەیشتم خۆم بشۆم، (ئینشاالله) ئێوارە بگەڕێمەوە دەست بە نوێژ دەکەم.

چووینە سەر ئیش و کارەکەمان تا کاتی چێشتەنگاو لە ناو گەرمەی ئیش و کارەکەماندا بووین، کە شوێنەکمان سەب دەکرد بە چیمەنتۆی ئامادەکراوی کۆنکریتی کە بە لۆری دەهاتو بە لوولەی سۆندەکە شوێنەکەمان پێ سەب دەکرد، سەر وەستاکەی کە سەببەکەی لووس و ڕێك دەخست، بانگی ئەو کوڕە گەنجەی کرد کە خەوەکەی بینی بوو، ووتی: وەرە ئەو لوولەی سۆندەم بۆ بگرە تا دەچم ئەو ماڵنجە دەهێنم، ئەو وەستایە چەند هەنگاوێك دوور کەوتەوە هەر هەندەی زانی بووە گرمە گرمەو دەنگێکی ئەوتۆ بەرز دەبۆوە کە زۆر ترسناکبوو

کاتێکمان زانی ئەنیشکی ئەو لۆریەی کە بارهەڵگری چیمەنتۆکە بوو بە زەخت عالی تاوەرێکی کارەبا کەوتبوو بۆیە ئەو گەنجە جوانەی کە تەمای تۆبەو گەڕانەوەو نوێژ کردن بوو لە چیمەنتۆکەدا ووشکی کردبۆوەو سووتاندبووی.

بەرنامەی ڕۆژووەوان: دوای ڕۆژهەڵاتن دوو کاتژمێرێك بخەوە ئینجا کە لەخەو هەستای:
ئیش و کارو پێویستی خۆت جێ بەجێ بکە لەماڵەوە بێت، یالە دەرەوەو بازاڕ بێت:

١ـ زۆر مەچووە بازاڕ، دەتوانی هەفتانە ڕۆژێك یادوو ڕۆژ تەرخان بکەی هەرچی پێویستی ماڵەوەیە بەیەکجاری بیکڕیت.

٢ـ ئاگاداری زیادە ڕەوی کردن لە خەرجی و خواردن وامەزانە ڕەمەزانە تەنها مانگی خواردن و خواردنەوەیە بزانە خەڵکێك هەیە لەشارەکەی نانی پارشێوو بەربانگی نیە.

٣ـ هەولّبدە بەشێك قورئان بخوێنی .

٤ـ سەردانی خزم و کەسوکارت بکە، بەتایبەت کەسانی پێویست و پەك کەوتە.

٥ـ لەو ماوەدا وانەیەکی شەرعی بخوێنە.

بزانە: تەوبە پەشیمان بوونەوە تەنها بۆ گوناهو تاوانی گەورە نیە، بەلکو گوناهی بچوکیش ئەگەر کەڵەکە بوو گەورە دەبێت بۆیە زانایان دەڵێن: (لا الكبيرة مع الإستغفار ولا الصغيرة مع الإصرار) واتە: (گوناهی گەورە نامینێت لەگەڵ تۆبەو داوای لێخۆشبوون کردن، وە گوناهی بچوکیش بە بچوکی خۆی نامینێت لەگەڵ بەردەوامبوون لەسەری ـ بەڵکو دەبێتە گوناهێکی گەورە ـ) وە پێغەمبەری خواش(ﷺ) دەفەرمووێ: ((إياكم ومحقرات الذنوب)) واتە: (ئاگاداری بەکەم سەیرکردنی گوناهو تاوانان بن)

بڕیاری گۆڕانکاری بدە: لەو ڕەمەزانە پیرۆزەدا بیرێك لەمنداڵەکانت بکەوە، بزانە ئەومنداڵانە یا بۆ تۆ زەخیرەو توێشووی قیامەتن، یامایەی شەرمەزارین بۆت، خۆراکی دۆزەخن، بزانە تۆ بەرپرس ولێپرسراوی و پرسیارت لێ دەکرێتەوە لەدین و ڕەوشت و هەڵسوکەوتیان، فێری نوێژو ڕۆژوویان بکە، بەتایبەت قورئان خویندن، تا تاجی ڕێزو شکۆداریت پێ ببەخشرێت، وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووی: (( من قرأ القرآن و

تعلمه و عمل به ألبس يوم القيامة تاجا من نور ضوؤه مثل ضوء الشمس و يكسى و الديه حلتان لا يقوم بهما الدنيا فيقولان بما كسينا فيقال بأخذ ولدكما القرآن)) {موسلم گێراویەتیەوە}

واتە: (ئەوی قورئان بخوێنێت و خەڵك فێر بكات و كاری پێ بكات، لەرۆژی دوایی تاجێكی پڕشنگدار (نورینی) لە سەری دەنرێت وەك تیشكی رۆژ دەدرەوشێتەوە، دایك و باوكەكانیشیان دوو بەرگیان بەبەردا دەكرێت دەڵێن: بەهۆی چ كارێكمانەوە ئەو بەرگەمان بەبەردا كرا پێیان دەڵێن: بەهۆی قورئان خوێندنی منداڵەكەتانەوە).

پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرمووێ: (ئایا ئاگادارتان بكەمەوە بە دەردەكانتان و دەرمانەكانتان ؟ ووتیان: بەلێ ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: دەردەكانتان گوناهو تاوانەكانتانە، دەرمان و چارەسەریەكەشی تەوبەو ئیستیغفارە)

# خەلاتی نۆیەم

## نرخی تۆ بەهەشتە خۆت هەرزان فرۆش مەکە

ئیبن و قودامە لە کیتابی (التوابین)دا لە عەبدولواحیدی کوڕی زەید (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەفەرمووێت: لە ناو کەشتیەکدا بووین باو باران و شەپۆلەی دەریا هەڵی کردو ئێمەی هەڵدا دوورگەیەك، پیاوێك لەو دوورگەیە بوو هیچ ئیش و کارێکی نەبوو جگە لە پەرستنی بتێك، بۆیە چووین لای و پرسیارمان لێی کرد، ووتمان ئەی پیاو: تۆ چ دەپەرستی؟ ئاماژەی بۆ بتەکە کرد، ئێمەش لە ناو کەشتیەکە شتی هاو شێوەی وەك بتەی تۆمان هەیە، ئەمە خودا نیە تا بپەرسترێت، ووتی: ئەی ئێوە چ دەپەرستن؟ ووتمان: (الله). ووتی: ئەو (الله) چی یە؟ ووتمان: ئەو خودایەیە کە عەرشی لە ئاسمانەو، دەسەڵات و فەرمان ڕەوای زەویەو، خاوەن بریارە بۆ هەموو زیندوو مردوویەك.

ووتی: چۆنتان ناسیوە؟

ووتمان: ئەو پادشایە نوێنەر (پێغەمبەر)ێکی خۆی بۆمان نارد، لەڕێگای ئەو پێغەمبەرەی ناسیومانە.

ووتی: ئەی ئەو پێغەمبەرە چی بەسەر هات؟

ووتمان: پەیامەکەی گەیاندو دواییش خودای گەورە بۆ لای خۆی بردەوە.

ووتی: ئەی هیچ شوێنەوارێکی لە دوای خۆی بەجێ نەهێشت؟

ووتمان: بەڵێ نامەیەکی ئەو پادشایەی لامان جێ هێشتووە.

ووتی: ئەو نامەی پادشایەم نیشاندەن، چونکە نامەی پادشایەکی وا گەورە دەبێت زۆر باش بێت، بۆیە قورئانەکمان پێیدا.

ووتی: من نازانم بیخوێنمەوە، ئێمەش سورەتێك لە سورەتەکانی قورئانی پیرۆزمان بۆی خوێندەوە، ئێمە بەردەوام بۆیان دەخوێندەوە ئەویش دەگریا تا هەموو سورەتەکەمان بۆی خوێندەوە.

ووتی: بەڕاستی پێویستە خاوەنی ئەم فەرمایشت و ووتانە سەرپێچی نەکرێت! پاشان موسڵمان بوو لەگەڵ خۆماندا، شارەزای ئایینی پیرۆزی ئیسلام و چەند سورەتێکی قورئانی پیرۆزمان کرد، ئینجا دوای هاتنی شەوو ئەنجامدانی نوێژی خەوتنان هەر کەس چووینە شوێنی جێگای نووستنمان، ئەو کابرایە بە ئێمەی ووت: ئەی خەڵکینە! ئەو خودایەی بە منتان ناساند کاتێ شەو دابێت دەنوێت؟ ووتمان نەخێر نانوێت ئەی بەندەی خودا! ئەو خودایەکی گەورەو ڕاگری بوونەوەرەو نانوێت، ووتی: خراپترین بەندە ئێوەن خوداو گەورەکەتان ناوێت، بەڵام ئێوە دەنون. زۆر سەیرمان بەو قسەی ئەو کابرایە هات، بۆیە کاتێ گەیشتینە (عەببادان) بەهاوڕێیەکانم ووت: ئەو پیاوە تازە بووەتە موسڵمان با یارمەتیەکی بدەین چەند درهەمەکمان بۆی کۆکردەوەو پێماندا. ووتی: ئەمە چی یە؟

ووتمان: بۆ خۆتی خەرجی بکە.

ووتی: لا إله إلا الله! شارەزای ڕێگایەکی خۆتان کردم، کاتێ من لە ناو دوورگەکانی دەریابووم و بتم دەپەرست منی فەرامۆش نەکردبوو، ئێستا فەرامۆشم دەکات کە دەی ناسم؟!

دوای چەند ڕۆژێك هەواڵیان پێدام ووتیان: وا لە سەرە مەرگدایە، چوومە لای و پێم ووت: چ پێویستیەکت نیە؟ ئەوەی ئێوەی بە ناچاری هێنا دوورگەکە هەموو پێویستیەکانی جێ بەجێ کردووە ـ مەبەستی خودای گەورە بوو.

عەبدولواحید دەفەرمووێ: خۆم پێ نەگیرا لای ئەو خەوم لێ کەوت لەخەما لای گۆڕستانی(عەببادان) باخچەیەکم بینی لەناو باخچەکە چادرەکی تێدابوو، لەناو چادرەکەش تەختەکی تێدابوو، کچۆلەیەك لەسەر تەختەکە دانیشتبوو، کە هەرگیز کچی واجوانم نەبینی بوو،

ووتی: توخوا خێرا نەبی بەڕاستی زۆر بەپەرۆشی دیداریمە، کاتێ بە ئاگا هاتم گیانی سپاردبوو، بۆیە شووشتم و، کفنم کردو، بە خاکم سپارد، کە بووە شەو نووستم ، لە خەوا بینیم لەگەڵ کچۆلەکە لە ناو چادرەکەدا بوون ئەو ئایەتە پیرۆزەی دەخوێندەوە: ﴿ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ﴾ {سورەتی الرعد: ئایەتی٢٣} واتە: (کە باخەکانی بەهەشتی ـ عەدەنەـ، بۆیان ڕازاوەتەوە، بەشادیەوە دەچنە

ناوی، هاورِێ لەگەڵ هەر کەسێك چاك و پاك و خواناسە لەباو باپیران و هاوسەرانیان و نەوەکانیان، جا فریشتەکان دەچن بۆ پێشوازیان لەهەموو دەروازەکانەوە)

با بەیەکەوە لەو باخچە پڕ لە گوڵ و گوڵزارەدا چەندین گوڵی جوان و نەخشین بچنین:

بزانە ناسینی خوداناسی و شارەزابوون لەخودای تاك و تەنیا چاکترین گەنجینەیە بۆ دونیاو دوارۆژ، بۆیە لە کۆنەوە خواناسان ووتیانە: (إذا كان الله معك فمن فقدك، وإذا كان الله فقدك فمن معك) واتە: (ئەگەر خودای گەورەت لەگەڵ بوو، کێت لەگەڵدا نیە، وە ئەگەر خودای گەورەت لەگەڵدا نەبوو کێت لەگەڵە)

کەوابوو خودای گەورە ژیان بەخش و ژیانتە، رۆزی دەرو ژینتە، مرێنەرو دوارۆژو گەرانەوت هەر بۆ لای ئەوە.

ئەگەر دەتەوێت بەتەواوی خودای گەورە بناسی و شارەزای بیت:

١ـ زۆر بیر لە دروست کراوەکانی خودای گەورەو بالاّ دەست بکەوە.

٢ـ تەفسیرو مانای ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بخوێنەوە.

٣ـ لەگەڵ ناوە جوان و پیرۆزەکانی خودای گەورەو میهرەباندا بژی: لەبەریان بکەو، خۆت لە ماناکانیان شارەزا بکەو، ئینجا پێیان بپارێوەو داوا لە خودای گەورە بکە.

٤ـ زۆر فەرموودە قودسیەکان بخوێنەوە.

٥ـ ئەو سەرچاوەو کتێبانە بخوێنەوە کە باس لە ئیعجازی زانستی قورئان و سوونەتی پێغەمبەر دەکەن(ﷺ).

* بۆ شارەزابوون و تێگەیشتنێکی تێروتەسەل لە بیروباوەرەکەی خۆت، پێویستە بچیتە خزمەت مامۆستایەکی شارەزا بۆ خوێندنی بابەتی بیروباوەر بە دەرس ئەگینا هەرگیز بەتەواوی شارەزای بیروباوەرەکەت نابیت بەتەواوی و بەوشێوەی خودای گەورە داوامانی لێ کردووەو، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) هاوەڵەکانی لەسەر پەروەردە کردن.

* سەبارەت بەم بابەتە ئەم کتێبانە بخوێنەوە: (الإيمان دانەری د. عەبدولمەجید زەنەدانی)، (سێ بنچینەکەی ئیسلام)، (أسماء الله الحسنى د. محمد راتب النابلسي)، (بەناوی تۆوە دەژین د. عەمرۆ خالید)

بڕوای ڕاستەقینە ئەو بڕوایەیە کە هەست و چاوێکی نا ئاسایی بۆ موسڵمان دروست دەکات،هەست نەستێکی ئەو تۆ وا کە بە قاچ لەسەر زەوی، بەڵام بە ڕۆح و گیان ودڵ لە ئاسمان و جیهانێکی تر: وەك حاریسەی تەمەن هەژدە ساڵی هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بەیانیەك دێتە خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێغەمبەری خوداش(ﷺ) پرسیاری لێ دەکات و پێی دەفەرمووێ: ئەی حاریسە ئەو بەیانیە چۆن بووی؟ ووتی: ئەو بەیانی یە خاوەنی بڕوایەکی ڕاستەقینە بوو، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: ئەی حاریسە هەموو قسەیەك بەڵگەی پێویستە، تۆ چۆن دەسەلمێنی کە خاوەنی بڕوایەکی ڕاستەقینەی؟ ووتی: کاتێ بەیانی وا هەستم دەکرد کە بە هەردوو چاوەکانم عەرشی خودای گەورە دەبینم و، وەك ئەوەی خەڵکی بەهەشتم دەبینی لەناو نازو نیعمەتەکانی بەهەشتداو، وەك ئەوەی خەڵکی دۆزەخ لەناو دۆزەخدا هاوارو فیغانیان بێت، بۆیە وازم لەدونیا هێناو شەوەکانم بە شەوونوێژ بەسەر دەبەم و، ڕۆژەکانیش بە بەڕۆژووبوون بەسەر دەبەم، پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) پێی فەرمووی: ئەی حاریسە ناسیوتە دەستی پێوە بگرە.

بەرنامەی ڕۆژووەوان: بۆ کاتی نوێژی نیوەڕۆ:

١ـ بەر لە(١٠ـ١٥) خولەکێك ئامادەبە لەمزگەوت.

٢ـ سووننەتی (چوونە ناو مزگەوت) بکە.

٣ـ تاکاتی بانگ چەند زیکرێك یا بڕێك قورئان بخوێنە.

٤ـ کەبانگدرا وەڵامی بانگەکە بدەرەوەو دوعای وەسیلە بکە.

٥ـ سووننەتەکانی هەرچوار ڕکاتی پێش وپاشی نوێژی نیوەڕۆ بکە.

٦ـ زیکرەکانی دوای نوێژەکە بکە.

بڕیاری گۆڕانکاری بدە: لەو مانگە پیرۆزەدا سەیرێکی دواوەی خۆت بکە، بزانە ڕێگاکەت چەند بڕیوەو چەندت ماوە، چەندی هەوڵدان بووە بۆ بەدەستهێنانی بەهەشت.

برای گەنج ولاوی ڕێزدار: بزانە چەند لەو دونیایە بەخۆشی بژی و تام وچێژی لێ بکەیت بەناشەرعی و ڕێگای نادروست ئەوەندە خۆشی و تام وچێژی بەهەشتت لێ کەم دەکاتەوە.

(إذا عرفت الآمر سهلت الأوامر)

واتە: (ئەگەر فەرمان دەرت ناسی، فەرمانەکانت لا ئاسان دەبێت)

# خەڵاتی دەیەمین

## لە لێبووردەیی خودای گەورە فێری لێبووردن بە

لەیادەوەری ڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەی پیرۆزدا کەلەکۆتاییەکانی سێیەکی یەکەمی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا، لە ب دەروازەو دەسپێکی سێیەمی دووەمی ئەو مانگە پڕ لەخێرەدا، لە لێبووردەیی بێ سنوورو ئەندازەی خودای گەورەو میهرەبان وپێغەمبەری سەروەر(ﷺ) فێری ڕەوشتی لێبووردن بین و وەك سەروەرمان دەفەرمووێ: ((تخلقوا بأخلاق الله)) واتە: (خۆتان برازێننەوە بە ڕەوشت سیفەتە جوانەکانی خودای گەورە).

### دەبا بەیەکەوە گوێ بگرین لەو بەسەرهات و ڕووداوە:

موسڵمانێکی بەڕێزو تێگەیشتوو خەمخۆر بۆ دینی خودای گەورە کە بازرگانێکی ئەو شارەی خۆمانە بۆی گێڕامەوە: ووتی ڕۆژێك لەدوکانەکەی خۆمدا بووم برادەرێك هاتە لام ماوەیەك دانیشت بینیم هەندێك شتومەکی هاوێشتە گیرفانی ـ دزی ـ، لەو کاتەی کە شتومەکەکەی برد بینیم، ئەویش زانی کە من بینیم و هەستم پێ کرد،بۆیە زۆر پێ تێکچوو هەستی بە شەرمەزاریەکی زۆر کردو کەوتە ناو ئارەقە، کارەکەیم زۆر پێ ناخۆش بوو چونکە زۆر هاموشۆی دەکردم و جێگای متمانەی من بوو زۆرم حەز دەکرد پێی بڵێم و ئاشکرای بکەم، بەڵام لە دڵی خۆمدا لە نێوان خۆم و خودای گەورە ووتم: ئەی خودایە لەبەر خاتری تۆ دای دەپۆشم و ڕسوای ناکەم بۆیە بەهیچ شێوەیەك وام نیشان نەدا کەهەستم پێی کردووە ئەویش دوای کەمێك هەستا ڕۆیشت کە ڕۆیشت پێیم ووت: ئیش و کارت چۆنە؟ باری دارایيت چۆنە؟ ووتی: زۆر خراپە ماوەیەکە ئیش و کارم نیەو وەزعم زۆر خراپە منیش (٣٠٠)دۆلارم دەرهێناو ووتم: ئەمە بۆ خەرجی خۆت و منداڵەکانت زۆر زیاتر هەستی بەتاوانو شەرمەزاری کرد، ووتی: نامەوێت پێویست ناکات ووتم: ئێمە براین دینەکەمان داوامان لێ دەکات کەهاوکاری یەکتر بکەین ئەمە شتێکی زۆر سادەو کەمە بەرامبەر بە

یەکتر ئەنجامی دەدەین، پارەکەی وەرگرت و ڕۆیشت دوای ساڵێك یا زیاتر لەمانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا تەلەفۆنێکی بۆم کردو ووتی: کاك فڵان ووتم: بەڵێ . ووتی: ووتی: گەردەنم ئازاد بکە. منیش زانیم مەبەستی چی یە بۆیە ووتم: چ بووە ووتی: دەڵێم گەردەنم ئازاد بکەو لێم خۆشبە ووتم: ئێمە براین سەدجار گەردەنت ئازاد بێت.

چیرۆکی دووەم: هەر ئەو موسڵمانە گێڕایەوە ووتی: برادەرێکی خەڵکی کەرکوك کە دوکاندارە ووتی: کەسێکی زۆر سەرەڕۆو خراپ هەبوو لەو بازارەی ئێمە کەسێکی شەڕاوی هەر بیناسیبا خۆی لێ لادەداو خۆی لێ دەپاراست ڕۆژێك ئەو کەسە خراپە لەگەڵ یەکێ لە خاوەن دوکانەکان بەشەڕهات زوڵم و ستەمێکی زۆری لەو خاوەن دوکانە کرد، یەکێ لە دراوسێیەکانی خاوەن دوکانەکە کەکەسێکی بەتەمەن و دینداربوو خۆی پێ نەگیراو چووە ناو بژێوانیان دەستی بەپاڕانەوە کرد لەو گەنجە سەرەڕۆیە کەواز بهێنێت بەڵام ئەو گەنجە خوانەناس وبێ ویژدانە تا هێزی هەبوو زللەیەکی لەو پیرە پیاوەدا ئەو پیاوە خواناس و بەتەمەنە تەنها ووتی: خوا خێرت بنوسی چۆوە دوکانەکەی خۆی.

بابزانین ئەنجامی ئەو خۆگرتن و ئارامی یەی ئەوپیاوە خواناسە چ دەبێت، ئەو مامە بەڕێزە دەڵێت: بۆ بەیانی بینیم ئەو گەنجە خراپە هاتە دوکانەکەم، بەڵام چۆن هاتنێك زۆر بەشەرمەزاری و ڕووزەردیەوە هاتە ژوورەوەو زۆر بەزەحمەت هەنگاوەکانی دەهاویشت زمانی تەتەڵەی دەکرد، هاتە لام و دانیشت وزۆر بە شەرمەوە ووتی: توخوا گەردەنم ئازاد بکە، منیش ووتم: چ بووە، بۆ کاتێ شەقەکەت لێمدا چ قسەیەکم کرد، ووتی: نەخێر هیچ قسەیەکت نەکرد، بەڵام بێ دەنگەیەکەت و قسە نەکردنەکەت ئەو دەرسە گەورەم لێی وەرگرت، (واللە) ئەمشەو خەو لەچاوی من نەکەوتووەو ئەو زللەی من لە تۆمدا، ئەو خۆگرتنو ئارامیەی تۆ هەموو ژیانی گۆڕی و ئێستاش هاتوومە داوای لێبوردن و گەردەن ئازاییت لێ بکەم، بەڵێنم داوە ببم بە مرۆڤ و وەك مرۆڤ بژیم، ئەوە هاتوومە داری تۆو پشتی من هەر چی بڵێی ڕاوەستاوم، بێگومان ئەو پیاوە خواناسە بۆ خاتری خوداو بەمەبەستی بەهۆش هاتنەوەی ئەو گەنجە لە کاتی زللەکە بە توانج پێی ووت: خودا خێرت بنوسی، بۆیە کە بەرهەمی خۆگرتن و ئارامیەکەی خۆی بینی، کە کارەکەی جێی خۆی گرتووەو کاری لەو

گەنجە کردووە، لەخۆشیا فرمێسك بەچاوەکانی هاتە خوارەوەو تا ئێستاش ئەو هاموشۆی دەکات و، ئەو گەنجەش ئێستا کەسێکی دیندارو خواناس و زۆر دەسگرتووە بە دین ـ سوپاس بۆخوداـ .

ڕۆژووەوانی بەڕێز خوشك وبرای سەنگین: ئەو مانگە مانگی ڕەمەزانە واتە مانگی ڕەحمەت وبەزەیی و میهرەبانی خودای گەورە، هەوڵدە لەو مانگە پیرۆزەدا لەگەڵ ناوە جوان و پیرۆزەکانی خودای گەورە بژی ئەو کاتە دەزانی ژیان چ ماناو تامێکی هەیەو، ژیان لەژێر ئەو ناوە جوان و پیرۆزانە چەند خۆش و بەچێژە، ئەو ناوە جوان و پیرۆزانە چ کاریگەریەکی هەیە لەسەر موسڵمان، هەر بۆیەش خودای گەورەو میهرەبان لە قورئانی پیرۆز فەرمان دەکات بە بڕواداران کە بپاڕینەوە بەناوە جوانەکانی خۆی وەك دەفەرمووێ: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ {سورەتی الأعراف: ئایەتی ١٨٠} واتە: (هەر بۆ خوایە هەموو ناوە جوان و پیرۆزەکان، جا(ئەی ئیمانداران) بەو ناوانە دوعاو نزا بکەن و هاناو هاوار بۆ ئەو زاتە بەرن، واز بهێنن لەوانەی کە لە ناوە پیرۆزەکانی خوادا لادان دەکەن و( سیفەت و ناوەجوانەکانی خوا بەکار دەهێنن بۆ غەیری خوا)، لەئاییندەدا پاداشتی ئەو کارو کردەوانەیان وەردەگرن کە ئەنجامیان دەدا)

وە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرمووێ: ((إن لله تعالى تسعة وتسعين إسما من أحصاها دخل الجنة)) واتە: (خودای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەیە ئەوەی سەرژمێری بکات دەچێتە بەهەشت)

## * سەرژمێری کردنیش بریتی یە لە :

ا- بڕوابوون بەو ناوە پیرۆزو جوانانە

ب ـ لەبەر کردنی .

ج ـ خۆشارەزا کردن لەماناکانی.

د ـ پاڕانەوە بەو ناوە پیرۆزانە.

* لە هەمووی گرنگ و پێویستتر ڕەنگدانەوەی ئەو ناوە پیرۆزانەیە لە ژیانی ڕۆژانەی موسڵمان و کاری پێ بکەین بۆ نموونە:

*خودای گەورە خاوەن ڕەحم و بەزەییەکی بێ سنوورو بێ ئەندازەیە، تۆش ڕەحم و بەزەییت هەبێت پێغەمبەر سەروەر(ﷺ) دەفەرمووێ: ((إرحموا من في الأرض يرحمكم من في السماء)) واتە: (بەزەییتان بێتەوە بە خەڵکی سەرزەوی خودای گەورەش بەزەییتان پێ دەکات)

* لێبوردەو چاوپۆشی بکە لە کەم و کورتی و هەڵەی خەڵکان هەروەك خودای گەورە لێبووردەو چاوپۆشی کارە، بەو ڕەشت وئاکارە جوانەش خودای گەورە پاداشتی گەورەت دەست دەکەوێت: وەك پێغەمبەری سەردار(ﷺ) دەفەرمووێ: ((أَيُّمَا رَجُلٍ أَعْتَقَ امْرَءًا مُسْلِمًا اسْتَنْقَذَاللهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْوًا مِنْهُ مِنَ النَّارِ)) {بوخاری گێڕاویەتەوە} واتە: (هەر کەسێك بەندەیەکی موسڵمان ئازاد بکات، خودای گەورە بەهەر ئەندامێکی ئەو بەندەیە ئەندامێکی ئەو رزگار دەکات لە ئاگری دۆزەخ) کەوابوو تۆش کاتێ کەسێك داوای لێبووردن و گەردەن ئازاییت لێ دەکات لێی خۆش ببە لەپێناوی خودای گەورە، یا ئەگەر نێوانت لەگەڵ کەسێك نیە دڵ و دەروونت پاك بکەوەو لەگەڵی ئاشت ببەوە، خودای گەورە بەگەورەیی خۆی کاتێ بەندەیەکی داوای لێخۆشبوون و تەوبەی لێ دەکات لێی خۆش دەبێت و لێی دەبوورێت هەر چەندی گوناهو تاوانی گەورەو زۆر بێت.

* خودای پەروەردگار بەشەرم و شکۆیە کەوابوو تۆش بەشەرم و شکۆو بەسەنگ بە، گەورەمان ئەبو بەکری سدیق لە ووتارێکی دەفەرمووێ: ((يا معشر المسلمين استحيوا من الله فو الذي نفسي بيده إني لأظل حين أذهب إلى الغائط في الفضاء متقنعاً بثوبي استحياء من الله عز و جل))

واتە: (ئەی کۆمەڵی موسڵمانان شەرم لەخودی گەورە بکەن سوێند بەو خودایەی کە گیانی منی بەدەستە کاتێ دەچم بۆ سەرئاو لە شەرمی خودای گەورە جلەکانم لە خۆم دەپێچم)

دە بزانە خوشکی گەورەو بەرێز: تۆ تا چ ئەندازەیەك شەرم لـەخودای گـەورە دەکـەیت و، جل و بەرگەکانت چەندی بە کوێرەی فەرمانی خودای گەورە و میهرەبانە، ئایا خودای گـەورە بەو بەرگ و پۆشاکەت رازیە؟ ئایا ئەو بۆیەو رەنگانەی خۆتی پێ دەرازێنیتەوە شـەرعی یـە؟ ئایـا باریـك کردنـەوەو بـرۆ کردنەکـەت خـودای گـەورە نـەفرەتی لێ نـەکراوە لەسـەر زاری پێغەمبەرمان(ﷺ)؟

٣ـ بەشداری بکە لەئامادەکردن و ڕازاندنەوەی خوان لەمزگەوت بۆ بـەربانگ، بەخزمـەت کردنی ڕۆژووەوانان.

٤ـ خۆت لەخێری بەربانگ کردنەوەو، ڕۆژوو پێ شکاندنی موسڵمانان بێ بەش مەکە.

پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرمووێ: ((من فطّر صائما كان له مثلُ أجره، غيرَ أنـه لا ينقص من أجر الصائم شيئا)) { تیرمیزی گێراویەتیەوە} واتە: (ئـەوەی ڕۆژوو بـە ڕۆژووەوانێـك بشکێنێ هەمان خێری ئەوی دەنوسرێت، بێ ئەوەی هیچ شتێك لەپاداشتی ڕۆژووەوانەکە کـەم بێتەوە).

## * بەرنامەی ڕۆژووەوان: بۆ نوێژی ( مەغریب ) و کاتی بەربانگ:

١ـ بەلای کەم (١٥) پازدە خولەك بەر لەنوێژی (مەغریب) لەمزگەوت ئامادەبە.

٢ـ ئەو کاتە کاتی پاڕانەوەیە زۆر بپاڕێوەو، تابانگ دەدرێت.

٣ـ وەڵامی بانگ بدەرەوەو دوعای وەسیلە بخوێنە.

٤ـ دوو ڕکات سوونەتی پێش (مەغریب) بکە.

٥ـ ئینجا نوێژی (مەغریب) بەکۆمەڵ لەمزگەوت بکە.

٦ـ زیکرەکانی دوای نوێژ بخوێنە.

٧ـ دوو ڕکات نوێژەکەی پاشی (مەغریب) هەوڵبدە لەماڵ بکە.

بریاری گۆڕانکاری بدە: ئەگەر پێت بڵێن پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەرەو شارەکەی تۆ بـەرێ کەوتووە، لەشارەکەی تۆش گەڕەکەکەی تۆی هەڵبژاردووە، لەگەڕەکەکەش بـەرەو کۆڵانەکـەی ماڵی تۆ بێت، لەو ماڵانەش یەکێ بنێرێتە لای تۆو بڵێ میوانی تۆم تۆ چـۆن پێـشوازی لـەو

خۆشەویستە دەکەی و (ﷺ) چی بە کچە سفورەکەت دلێی؟ تەلەفزیۆنەکەت دەخەیتە سەر چ کەنالێك؟ ئەو وێنانەی کەهەلْت واسیوە چی لیّ دەکەیت؟

# خەلاَتی یازدەهەم

## ئایا دەزانی خودای گەورە حەز دەکات لێت خۆشبێت

لەبەردەم سێیەکی دووەم ناوەڕاستی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا، دەچینە سەر باسی گەورەیی و فراوانی لێخۆشبوونی خودای گەورەو میهرەبان، ئەم بەسەر هاتەش ڕووداوێکی ڕاستەقینەی ئەم سەردەمەی ئێستایە، دەمان باتەوە دیمەشقی وولاَتی سوریا، شێخ (موحەممەد ڕاتب نابولسی) دەگێڕێتەوەو دەفەرمووێت:

کچێکی خوانەناسی دوور لە خودای گەورەو، بێ سەرو سەرەڕۆو بەناسنامەو بەناو موسڵمان، لێرەوە با لێ بگەڕێین ئەو کچە خۆی ڕووداوەکەمان بۆ باس بکات:

ئەو کچە دەڵێت من کچێك بووم بێ ئاگا، ئەوەی بە خەیاڵ و بیرم دانەدەهات دین و خودای گەورە بوو، هەموو ئاوات و ئومێدی من تەنها ڕابواردن و گاڵتەجاڕی بوو، کام جل و بەرگی ناشەرعی و نادروستبوو لەبەرم دەکردو دەم پۆشی، هەرچی مۆدیلات و داب و نەریتی ڕۆژئاوا هەبوو لە قژبڕین و، جل وبەرگ و ، پێڵاو ...هتد زوو بەزوو جێ بە جێم دەکرد.

تا لە ناکاو ڕۆژێك میوانێکم لێ پەیدابوو، هەرچەندە ئەو میوانە بە ڕواڵەت ناخۆش و ڕەزاقورسە لای هەموو کەسێك، بەڵام ئەم میوانە ئەم جارەیان بۆ من بووە مایەی گۆڕینی ڕێرەوی ژیان و دۆزینەوەی خۆم کاتێ لە بیابانی نەفامی و بێ ئاگاییدا دەخولامەوە، ئەو میوانە بووە فریادڕەس و پشتیوانی من لە گێژاوو گێژەلووکەی سەرگەردانی ڕزگاری کردم و دەری هێنام، بەڕاو بۆچوونی ئێوە دەبێ ئەو میوانە ناوەختە بە کەلکە کێ بێت و؟! چی بێت؟! ئەویش نەخۆشی یەکی پڕ لە خۆشی بوو!

چەند ڕۆژێك نەخۆش کەوتم، وورده وورده نەخۆشیەکەم زیاتر دەبوو، بۆیە چوومە سەردانی پزیشك، پزیشکەکە چەند پشکنینێکی تاقیگەیی بۆ نووسیم، منیش چوومە تاقیگە خوێنیان لێ وەرگرتم و ووتیان پاش کەمێکی وەرەوە، کاتێ چوومەوە بۆ وەرگرتنەوەی ئەنجامی پشکنینەکانم پزیشکی تاقیگەکە زۆر بە دڵتەنگی و غەمباریەوە سەیری دەکردم وەك

ئەوەی ڕووداوێکم بەسەردا هاتبێت، بۆیە هەستم بە شتێکی ناخۆش کرد، ووتم: چیە؟ ووتی: چ نیە بڕۆوە لای پزیشکەکەی خۆت ئەو پێت دەڵێت! زۆر دەترسام و، زۆر بە خێرایی چوومەوە لای پزیشکەکەم ئەنجامەکانم لەبەر دەمی دانا کاتێ یەکە یەکە سەیری ئەنجامەکانی کردو لێی ووردبۆوە، سەرێکی باداو زۆر بە پەرێشانی و دڵتەنگیەوە ڕووی تێکردم و ووتی: بەداخەوە.

ووتم: چی بووە دکتۆری بەڕێز!

ووتی: نەخۆشیەکەت باش نیەو شێر پەنجەیە بەهەموو لەشت بڵاو بۆتەوە، لەدەست دەرچووەو لە قۆناغەکانی کۆتاییە، بە پێی زانستی ئێمە ڕەنگە تەنها دوو سێ مانگی تر بژی.

ئەو هەواڵە چاوەڕوان نەکراوە، زۆر ناخۆش بوو، زۆر بێ تاقەتی کرد، بەڵام بە کەسی نەوت لە ئەندامانی خێزانەکەی، ئەو ڕووداوە لە ناکاوە هەرچی ئومێدو ئامانج و ئاواتی هەبوو ژێر خاکی کردو لە ناوی برد، دوای چەندین ڕۆژ بە تەنها لە ژوورەکەی خۆی بیری لە کارو کردەوەکانی ڕابردوو کردەوەو، هیچ چاکەیەکی ئەو تۆی بەدی نەکرد لە لاپەڕەکانی ڕۆژانی ڕابردووی، هیچ تروسکاییەکی نەدەبینی تا بەر پێیەکانی خۆی پێ ببینێ، تەنها ئەوەی بیری بۆ چوو ئەو دەستە خوشکەی بوو کە هاوڕێی بوو کۆلێژ، هەر چەندە پێشتر زۆر حەزی بە دیدەنی نەدەکرد، چونکە لە هەموو شتێکدا لە بیرو بۆچوون و هەڵسوکەوتدا بەتەواوی لەیەك جودا بوون، بەڵام ئێستا کاتێ لە لێواری مردنە دەزانێت قسەکانی ئەو تەواوو دروستە، بۆیە بۆ یەکەمین جار پەیوەندی پێوە کردو، ئەو کچە خواناسەش بە بێ سێ ودوو بە هانای هات و سەردانی کرد، دوای دڵدانەوەو دڵنەوایی کردن و باسی گەورەیی و فراوانی ڕەحمەتی خودای گەورەی بۆ کردو، ڕێگای تەوبەو پەشیمان بوونەوەی بۆ ڕوون کردەوەو، یەکەم کارێك کە پێی هەستا لەناو بردن و نەهێشتنی جل و بەرگە ناشەرعی و نادروستەکانی بوو، ئینجا دەستی بە نوێژ کردن کرد، ئەم کچە دیندارە خواناسەش بەردەوام هاودەم و یارمەتی دەری بوو، ناوە ناوە خەڵکانی شارەزا لە دین و خواناسی پێ دەناساند، دەی بردە شوێنی چاك و باش و پیرۆز.

دوای ماوەی نزیکەی مانگێك پاش ئەوەی ئەم کچە دەقی بە دینداریەکی تەواو گرت و، کەوتە ناو ژیانی ڕاستەقینە، شارەزای بەشێکی زۆری ئاینەکەی بوو، کەوا هەستی دەکرد تازە لە دایکبووەو، هەرچی نەخۆشی وغەم و پەژارە هەیە لە بیری کرد بەهۆی نازو نیعمەتی خوداناسی و دۆزینەوەی خۆی، ڕۆژێك لە ناکاو زەنگێکی تەلەفۆنەکەی لێیدا، کاتێ هەڵی گرت، کابرا بە شەرم و شەرمەزاریەکی زۆرەوە ووتی: جەنابت فڵان کەسی؟ ووتم: بەڵێ، دوای ئەوەی پۆزشێکی زۆری هێناوەو، ڕێزێکی زۆری لێم گرت، ووتی: حەز دەکەین بتبینین. منیش ووتم: بۆ چی؟ خێرە؟ ووتی: حەز دەکەین لە نزیکەوە پێت بڵێین، کە هاتی دەزانی! منیش بە ئەو پەڕی دوودڵی و دڵە ڕاوکێیەوە چووم، کاتێ چووم، هەستم دەکرد هەر هەموویان هەست بە شەرمەزاری دەکەن، نەیان دەزانی چۆن چۆنی دەرگای باسەکە بکەنەوەو قسەم لەگەڵدا بکەن، پاشان بەڕێوەبەرەکە دەستی بە قسە کردن کردو ووتی: ئێمە گەورەترین هەڵەمان لەگەڵ تۆ کردووەو، ئەگەر تۆ لێمان نەبووری لە دونیاو دوارۆژ ئێمە شەرمەزارو قەرزاری تۆ دەبین، ئێمە بە هەڵە ئەنجامی کەسێکی ترمان داوەتەوە تۆو، کە گوایە تۆ شێر پەنجەتە! بەڵام لە ڕاستیدا تۆ هیچ نەخۆشیەکی ترسناکت نەبووە، ئەم کچە دەڵێت کاتێ ئەو هەواڵەم بیست زیاتر میهرەبانی خودای گەورەو، گەورەیی ڕەحمەتەکەییم بۆ بەدەر کەوت، بۆیە خۆم پێ نەگیراو بە بێ ویستی خۆم فرمێسك بە چاوەکانمدا دەهاتە خوار، زانیم کە خودای گەورە بە زۆری بەبێ ویستی خۆم و بەناچاری منی گێڕاوە بۆ ناو باوەشی گەرمی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

خوشکانی بەرێز: ئەو جارەش سوارچاکی گۆڕەپانی ڕووداوەکە دوو ئافرەتی بەڕێزن، کەوابوو ئێوەش ئەرکتان لەسەرەو، پێویستتان بە ڕەحمەت و میهرەبانی خودای کار بەجێ یە، تەنها بۆ ناو مەتبەخ و چێشت لێنان دروست نەکراون، بزانن ئەوەی خودای گەورە لە سەر پیاوانی نووسیوەو فەرزکردووە لەسەر ئێوەشە، ئێوەش دەمرن و پرسیاری گۆڕتان لێ دەکرێت‌و زیندوو دەبنەوەو، دۆزەخ و بەهەشت بۆ ئێوەشە هەروەك بۆ پیاوانە.

**کەوابوو ئاگاداری ئەم خاڵانە بە:**

١ـ لەو مانگەدا بێ ئاگاو غافل مەبە، رازی مەبە هەر تەنها خەریکت بکەن بە ئامادەکردنی خواردن و چێشت لێنان و، کاتە زێرینەکانت لە مەتبەخ بەسەر ببەیت.

٢ـ ئەرکی بانگەوازی لەسەر تۆی ئافرەتیشە، بە کوێرەی ئاستی زانیاری زانینت خەڵکی ئامۆژگاری بکە.

٣ـ بزانە ئاگاداربوون لە شێوازی جل و بەرگ و پۆشاکەکەت گرنگترو پێویست ترە لە نوێژەکانت، چونکە نەکردنی نوێژ تەنها زەرەرو زیانی بۆ خۆت هەیە، بەڵام پۆشینی پۆشاکی ناشەرعی زەرەرو زیانی خۆت خەڵکانی تریشی هەیەو خەڵکیشی پێ گوناهبار دەبێت.

٤ـ دڵسۆزو بە بەزەیی بە لەگەڵ ئەو دەستە خوشکانەی کە لارێی و بێ دینن، چونکە رەنگە رۆژێك قسەکانت لەدڵیاندا زیندوو ببێتەوەو کاریان تێ بکات.

٥ـ پەروەردەکردنی منداڵەکانت گەورە ترین ئەرکە، بەتایبەت کچەکانت زیاتر لە ئەستۆی تۆدایە، پەروەردە کردنی هەر کچێك دەرگایەکە لە دەرگاکانی بەهەشت، وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) رۆژێك فەرمووی: هەر کەسێك سێ کچ پەروەردە بکات، بە پەروەردەکرنێکی جوان و دیندارانە خودای دەیباتە بەهەشت، یەکێك ووتی ئەی پێغەمبەری خۆشەویست ئەی ئەگەر دووان پەروەردە بکات فەرمووی: ئەگەر دوانیش بێت، ئەو پاداشتەی هەر بۆ هەیە)

٦ـ خوشکی بەرێزم نوێژکردنەکەت و بەرۆژوو بوونەکەت لەگەڵ سەرپۆش لەسەرنەکردنەت و برۆکردنەت و مکیاژ کردنەکەت، هەڵبسەنگێنەو بەراورد بکە، لەگەڵ ئەو هەموو گوناهو تاوانانەی کەتووشی خۆت و خەڵکانی تری دەکەی.

٧ـ بەشداری کۆڕو کۆبوونەوە دینی و ووتارە ئایینیەکانی رۆژانی هەینی و کاتەکانی تر بکە.

٨ـ خۆت شارەزا بکە ژیاننامەو هەڵوێست و رۆڵی ئافرەتانی دیندارو خواناس و رۆشەنبیرو ناودار، تا بیان کەیتە شەرمەشق و چاوساغی خۆت.

٩ـ هاندەرو پشتیوان بە بۆ پیاوەکەت منداڵەکەت بۆ کاری چاکەو خێر، پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) دەفەرمووێ: (ڕەحمەتی خودا لەو پیاوەی کە شەو هەڵدەستێت بۆ نوێژ کردن، خێزانەکەشی بە ئاگا دەهێنێت، ئەگەر بەئاگا نەهات ئاو دەپرژێنێت بە دەم و چاوی، ڕەحمەتی خودای گەورەش لەو ئافرەتەی کە هەڵدەستێت بۆ شەوو نوێژ پیاوەکەشی بە ئاگا دەهێنێت، ئەگەر بە ئاگا نەهات ئاو دەپرژێنێت بەدەم و چاوی)

١٠ـ خوشکی گەورەو بەڕێز: بڕوانامەو زانست و زانیاریەك، ئەگەر نەبێتە چرایەك بۆ قەبرو قیامەت و دوارۆژت، چ کەلك و سەنگێکی هەیە، بۆیە دوارۆژی خۆت رووناك بکەوە بە قورئان و زانستەکانی، بزانە پێغەمبەرەکەت کێ یەو، خاوو خێزانەکانی بناسە.

کەوابوو بزانە: تۆ کەم و لاواز نی بەڵکو: ((وراء کل رجل عظیم إمرأة))

واتە: (هەموو پیاوێکی گەورەو ناودار ، ئافرەتێکی لە پاڵدا بووەو پشتیوانی بووە)

ئەگەر سەیری قورئانی پیرۆزیش بکەین ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت:

باوکە ئادەم + دایکە حەوا= بەرەی مرۆڤایەتی

گەورەمان موسا + ئاسیای دایکی= سەرکەوتن بەسەر فیرعەون

گەورەمان عیسا + مەریەمەی دایکی= گەورەترین موعجیزەی خودا ﴿ وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ ﴾ {سورەتی المؤمنون: ئایەتی ٥٠} واتە: (هەروەها کوڕەکەی مەریەم و دایکیمان کردە بەڵگەو نیشانە (لەسەر توانایی خۆمان) و ئێمە هەردووکیمان حەوانەوە لەشوێنێکی بڵندو خۆش و سازگارو ئاوداردا)

گەورەمان ئیبراهیم + سارا خاتوونی خێزانی= سەرکەوتنی لە شۆرشی یەکتاپەرستی

گەورەمان خۆشەویست + خاتوو خەدیجەی خێزانی= ڕەواندنەوەی تاریکی نەفامی و بت پەرستی.

## * بەرنامەیەکی تایبەت بەزیکری (ئیستیغفار):

ا- رۆژانە بەلای کەم (١٠٠) سەدجار ئیستیغفار بکە، چونکەپێغەمبەری خودا(ﷺ) رۆژانە سەدجار لەیەك دانیشتن دەی فەرموو: ((أستغفرالله العظیم وأتوب إلیه))

ب - داوای لێخۆشبوون بکە بۆ ئیمانداران، پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) دەفەرمووێ: (ئەوەی بڵێ: داوای لێخۆشبوون بۆ سەرجەم ئیماندران بکات، خودای گەورە بەژمارەی ئەو ئیماندارانە لێی خۆش دەبێت)

ج - ئەو رەمەزان بگێڕە بە وێستگەی گۆڕانکاری تاك تاکی گوناهو تاوانەکانت بێنە بیرخۆت بخەرەوەو بێنە پێش چاوی خۆت، ئینجا بۆ هەرگوناهو تاوانێك تەوبەو ئیستیغفارێك بکەو، بەڵێن بدە خودای گەورە نەگەڕێیتەوە سەریان.

د - زۆر ئاگاداری ئەو بەخشش وخەڵات ودیاریەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەویش دوعای (گەورەترین ئیستیغفار)ە، لەو مانگەدا لەبەری بکەو، هەموو بەیانی و ئێوارەیەك بیخوێنە، تادەقی پێوە بگریت، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرمووێ: (هەر کەسێك بڵێت: (اللهم أنت ربي لا إله إلا أنت خلقتنی وأنا عبدك وأنا علی عهدك ووعدك ما استطعت ابوء لك بنعمتك وأبوء لك بذنبی فاغفر لي فإنه لا یغفر الذنوب إلا أنت أعوذ بك من شر ما صنعت) ئەوەی بەیانیان ئەو زیکرە بخوێنێت لەرۆژەکەیدا بمرێت دەچێتە بەهەشت، وە ئەوەی ئێواران ئەو زیکرە بخوێنێت لەوشەوەدا بمرێت دەچێتە بەهەشت

ه - ئەگەر دڵتوندو دڵ بەغەمی، ئەگەر دەرگاکانی دونیات بەڕووتدا داخراوە، باری دارایی و گوزەرانت خراپە (ئیستیغفار) بکە، پێغەمبەری سەردار(ﷺ) دەفەرمووێت: ((مَنْ لَزِمَ الاسْتِغْفَارَ جَعَلَ اللَّهُ لَهُ مِنْ كُلِّ هم فَرَجًا ، وَمِنْ كُلِّ ضِيقٍ مَخْرَجًا وَرَزَقَهُ مِنْ حَيْثُ لاَ يَحْتَسِبُ )) .

بڕیاری گۆڕانکاری بدە: هەر هەموو گوناهو تاوانەکانت بێنە بەرچاوی خۆت، یەك یەك تۆبەو ئیستیغفاری لێ بکەو ، پەیمان بدە نەگەڕێیتەوە سەری و، ئەگەر مافی خەڵکیشت بەسەرەوەیە مافەکە بۆ خاوەنەکەی بگێڕەوەو داوای گەردەن ئازادی لێ بکە.

# خەلاّتی دوانزەهەمین

## ئەو خۆشیەی تێیدای ببەخشە

یەکێ لەئەرك خێرو عیبادەتانەی ئەو مانگە پیرۆزە بانگەوازیە بۆ لای خودای گەورەو میهرەبان، هەر یەکێ لە ئێمە بەرپرسیارە لەو نازو نیعمەتەی تێیدایەو، کەخودای گەورە بەهەر تاکێکی ئێمەی موسلّمانی بەخشیوە، هەموو نازو نیعمەتێکی خودای گەورەش پێویستی بە سوپاسگوزاری هەیە، هەر نیعمەت و چاکەیەکی خودای گەورە بەشێوازێکی تایبەت بە خۆی سوپاس دەکرێت بۆنموونە، سوپاسکردنی نیعمەتی مالّ بەبەخشینیەتی، سوپاسی نیعمەتی زانست و زانیاری بەفێرکردنی خەلّك و گەیاندنیەتی، سوپاس کردنی نیعمەتی مندالّ و خێزان بە پەروەرکردنیانە بەپەروەردەیەکی موسلّمانانە، سوپاسی نیعمەتی زوبان پاراوی و قسەزانی بەئامۆژگاری کردنی خەلّکانە:

شێخ موحەممەد عورەیفی باسی ڕووداوێکی ڕاستەقینە دەکات، برادەرێکم موسلّمانێکی تێگەیشتوو شارەزا لە دین باوکی توشی نەخۆشیەکی کت وپڕبوو، ئەو نەخۆشیەی ئەو چارەسەری نەبوو لەووڵات بۆیە ووتیان چارەسەری ئەو نەخۆشیە لە لەندەنی ووڵاتی بەریتانیایە، ئەو پیاوە موسلّمانە خواناسەش وەك ئەرکێکی موسلّمانانە لەگەلّ باوکی چوو بۆ بەریتانیا، ئەو پیاوە کەسێکی گوج و گۆلّ و ڕێك و پێك و تونـد و تۆلّ، تابلّێی شێوەو ڕوخسارێکی جوان و پاکی هەبوو، ڕیشێکی درێژی شانەکراو، سیواکێکی ئەستورو درێژ لەسەر گیرفانی، بەردەوام بۆنێکی زۆر خۆشی لێ دەهات، هەردەم ڕووی بە خەندەو پێکەنین بوو، هەرگیز هەستی بەبێزاری و دلّتەنگی نەدەکرد، دەبا بەیەکەوە کوێ لەخودی خۆی ڕابگرین باسی ئەو سەفەرەی خۆییمان بۆ بکات: دەلّێت کاتێ لە فڕۆکە دابەزین ڕوومان لەو نەخۆشخانە کرد کە ناونیشانەکەیان پێ دابووین، ژوورێکیان پێدایـن تێیدا نیشتەجێ بووین تا بەیانی ئەو پزیشکەی بۆیان دیاری کردبووین هاتە لامان، منیش بە ڕوویەکی گەشاوەوە

پێشوازیم لێی کردو، پشکنینی پێویستی بۆ باوکم ئەنجامدا، بـۆ چـەندین رۆژ ماینـەوە ئـەو پزیشکەش ناوە ناوە دەهاتە لامان.

تا رۆژێك ووتی: من پرسیارێکم لە تۆ هەیە؟ ـ دیارە ئەو موسـڵمانە زمـانی ئینگلیـزی زانیوە ـ

منیش زۆر بەڕوو خۆشی و سینگێکی فراوانەوە

ووتم: فەرموو

ووتی: زۆر سەیرم بە تۆ دێت چەند رۆژە لەگەڵ ئەوهەموو کێشەو گیرو گرفتانەی خـۆت و ئەو هەموو ئەرك و زەحمەتیەی کە لەگەڵ ئەو نەخۆشەدای و سەرباری ئەوەی ژیـانی غـەریبی ودوور لە ماڵ و منداڵ بەڵام تۆ لە خەندەو پێکەنین و زەوق زیاتر هیـچی تـرم لـەتۆ نـەبینی، بەڵام من خەڵکی ئەو شارەم یەکێکم لەهەرە دەوڵەمەندەکانی ئەوشارەو لە هیچ شـتێکم کـەم نیە، کام شوێن وباخچەی خۆش و دڵڕفێنی ئەو شارەیە دەچم، کام خواردنی خۆش و بەلەزەتـە دەیخۆم، کام گۆرانی و مۆسیقای بەسۆزو بەچێژە کوێی لێ رادەگرم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هـەر دڵم تەنگەو نائارامم نازانم بۆچی؟!

منیش پێکەنیم دوایی سەیرێکم کردو پێیم ووت: من پرسیار لە تۆ دەکەم؟

ووتی: فەرموو

ووتم: ئەگەر برسیت بێت دەچی شتێکی بۆن خۆش بۆن بکەیت؟!

ووتی: نەخێر، بەڵکو دەچم نان دەخۆم.

ووتم: ئەی ئەگەر حەز بکەیت کوێت لە دەنگ و مۆسـیقایەکی خـۆش بێـت دەچـی نـان بخۆیت؟!

ووتی: نەخێر، بەڵکو دەچم ئامێرێکی دەنگهێنەر کار پێ دەکەم و تا کـوێم لـەدەنگێکی خۆش بێت.

ووتم: ئەگەر حەز بکەیت دیمەنێکی جوان و دڵڕفێن ببینیت تا چێژ بەچاوەکانت بگات ئایا دەچی گوڵێك بۆن بکەیت؟!

ووتی: بێگومان نەخێر، بەڵکو دەچم بۆناو باغ و باخچەی پڕ لەگوڵ و گوڵزار.

ووتم: کەوابوو تۆ شوێنێکت دێشێت و بەڵام تۆ چارەسەری شوێنێکی تر دەکەیت بۆیە ناگەیت بەئامانج، کێشەو گرفتی تۆ لە دڵتە وەك دەڵێیت دڵم نا ئارامە بۆیە پێویستە چارەسەری ئەو دڵەی خۆت بکەیت.

کتێبێکی وەرگێڕدراوبۆ زمانی ئینگلیزیم لەگەڵ خۆمدا بردبوو پێمداو لەگەڵ خۆی بردی.

بۆڕۆژی دوایی بینیم بەیانی زوو هات کەهات شێوەی ئاسایی نەبوو تەواو روخسارو شێوەی گۆڕابوو زۆر مەترسیداربوو، هەر کەهات پرسیارم لێی کردو ووتم: بێ زەحمەت چی رووی داوە هەر لەگەڵ قسەیە دەستی کرد بەگریان و یەخەی منی گرت و چەند جارێك ڕای تەکاندم ووتی: ئێوە لەو خۆشی و تام و چێژەدان بۆ ئەو خۆشی و نیعمەتە نابەخشنەوە، (واللە) تەنها ئەو شەو لەڕێگای ئەم کتێبەی تۆوە خوداو ئیسلامم ناسیوە هەست لەخۆشترین ژیاندام.

## براو خوشکی خۆشەویست دەبا لەم ڕەمەزانەوە بەڵێن بدەین:

١ـ خۆمان شارەزا بکەین لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

٢ـ ئینجا بەتەواوی و بەبێ کەم و کورتی ئایینی ئیسلام جێ بەجێ بکەین وەك خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةً وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴾ {سورەتی البقرە: ئایەتی ٢٠٨} واتە:(ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە هەر هەموتان خۆتان بخەنە ژێر سایەی ئیسلامەوە و بەتەواوی پەیڕەوی بکەن و شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، چونکە ئەو دوژمنی ئاشکراتانە(هەمیشە دەیەوێت شەڕو جەنگ لە نێوان خەڵکیدا بەرپا بکات و لەئیسلام دووریان بخاتەوە).

٣ـ بیر بکەوەو وورد ببەوە لەخودی بزانە چ کەم و کورتیەکت هەیە بەرامبەر بە خودای گەورەو میهرەبان، بەرامبەر پێغەمبەری سەروەرو(ﷺ) خەڵکان هەر هەموو کەم و کورتیەکان وورده وورده چاك بکەوەو مەیان هێڵە.

٤ـ دوایی دەست بکە بانگەوازی کردن لەنزیك ترین کەستەوە دەست پێ بکە، خێزانەکەت ومندالّەکانت، خزم و دۆست و دراوسێکانت، بەرە بەرە هەرکەسەو دەردەکەی ببینەوە دوایی بە دوای چارەسەر بۆی بگەرێ .

* بۆچی بانگەوازی بکەین؟

ا- بۆ جێ بە جێ کردنی فەرمانی خودای کاربەجێ وەك فەرمانی پێ کردووەو دەفەرمووێ: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴾ {سورەتی النحل: ئایەتی ١٢٥} واتە: ((ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەی ئیمانداران) بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامەو رێبازی پەروەردگارت بە حیکمەت و دانایی(بۆ هەندێك) و ئامۆژگاری جوان و بەجێ(بۆهەندێکی تر)و گفتوگۆو موجادەلە بەجوانترین شێوە(لەگەلّ هەندێکی تردا بە تایبەتی خاوەن کتێبەکان)، چونکە بەراستی پەروەردگارت هەر خۆی زانایە، کە کێ گومرایە، هەروەها خەر خۆیشی زانایە بەهیدایەت وەرگران)

ب ـ بەجێهێنانی سوونەتی پێغەمبەرانە(سەلامی خودایان لەسەر بێت)، بەمەش دەبیتە دۆست و هاودەمی ئەو خۆشەویست و بەرێزانە.

ج ـ گەورەترین خێرو پاداشتت دەست دەکەوێت، وەك پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بەپێشەوا(عەلی) دەفەرمووێ(خودای لێ رازی بێت) لەو کاتەی دەی نێرێت بۆ جەنگی خەیبەر: (( لئن يهدي بك الله رجلا واحدا خير لك من حمر النعم)) واتە: (ئەگەر یەك تاکە پیاو بە هۆی تۆوە خودای گەورە رێنموونی بکات بۆتۆ باشترە لە چەندین ووشتری سوور ـ کەباشترین و بەناوبانگترین ووشتی عەرەبەکان بووە ـ)

د ـ خێرو پاداشتێکی نەبراوەی بێ ماندوو بوونە، وەك خۆشەویست دەفەرمووێ: ((من دل على خير فله مثل أجر فاعله)) واتە: (هەر رێگای خێرو چاکە بەیەکێ نیشان بدات هەمان خێری بۆ دەنوسرێت بەبێ لەخێری ئەویش کەمبێتەوە)

هـ ـ خۆشترین و بە تامترین ژیان ژیانی بانگخوازانە لەڕووی دڵ و دەروونیەوە، بەردەوام لەرێی خودای گەورە وەك سەربازێکی نەناسراو لەخزمەت ئایینی خودای گەورەو بەندەکانی خودای گەورەی.

## * گرنگترین ئاکارو ڕەوشتەکانی بانگخواز:

١ـ لەڕووی دڵ و دەروون و خودی خۆیەوە، ئەم رەوشت و ئاکارانە بکات بە کاڵای باڵای خۆی وەك خودای گەورە لە هەردوو سورەتی (المزمل) و (المدثر) فەرمان بەپێغەمبەری نازدار() دەکات و دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢﴾ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ﴿٣﴾ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾ إِنَّا سَنُلْقِى عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ﴿٥﴾ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ هِىَ أَشَدُّ وَطْـًٔا وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴿٦﴾ إِنَّ لَكَ فِى ٱلنَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا ﴿٧﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا ﴿٨﴾ رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا ﴿٩﴾ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ﴿١٠﴾ وَذَرْنِى وَٱلْمُكَذِّبِينَ أُو۟لِى ٱلنَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا ﴾ {سورەتی المزمل: ئایەتی(١ـ١١)} واتە: (ئەی ئەو کەسەی خۆت داپۆشیوە مەبەست پێ پێغەمبەرە (ﷺ) * شەو هەستە نوێژ بکە مەگەر کەمێکی نەبێت * نیوەی یاکەمتر لە نیوەی لێ کەم بکەرەوە * یاخود زیاتری بکەو دەوری قورئان بکەرەوە بەووردی و لەسەرە خۆیی * چونکە بەڕاستی ئێمە فەرمودەو گوفتارێکی سەنگین دادەبەزێنینە سەرت(کەبەهۆیەوە بەرەنگاری ئەرك و زەحمەتی زۆر دەبیت) *بەڕاستی خۆپێگەیاندن لەشەودا قورسترە لەڕووی کردارو باشترە لەڕووی گوفتارەوە * تۆ بۆت هەیە لە رۆژدا هەوڵ بدەیت(بانگەواز بکەیت) و بگەرێیت، کۆششی زۆر بکەیت* تۆ هەمیشە باناوی پەروەردگارت ویردی سەر زارت بێت، بەدڵسۆزی و ملکەچیەوە رووی تێ بکە*ئەو زاتەی کە تۆی رەوانە کردووە، خاوەن و پەروەردگاری رۆژهەڵات رۆژئاوایە، جگە لەو هیچ خوایەکی تر نیە فەرمانی بەدەست بێت، کەواتە هەر بکە بە پشتیوانی خۆت و داوای یارمەتی هەر لەو بکە * لەبەرامبەر گوفتاری خوانەناسانەوە هەردەم خۆ راگربەو بە شێوازێکی جوان بە جێیان بهێنە* واز بێنە لە من و لەو خاوەن نازو نیعمەتانەی کە ئایینی من بەدرۆ دەزانن، تۆ کەمێك مۆڵەتیان بدە)

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ (١) قُمۡ فَأَنذِرۡ (٢) وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ (٣) وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ (٤) وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ (٥) وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ (٦) وَلِرَبِّكَ فَٱصۡبِرۡ ﴾ {سورەتی المدثر: ئایەتی(١ـ٧)} واتە: (ئەی ئەو کەسەی خۆت پێچاوەتەوە ئەی موحەمەد(ﷺ)* هەستەو خەڵکی بێدار بکەرەوە(ڕاستیەکان ڕوون بکەرەوە)* پەروەردگارت بەگەورە ناو ببە(الله أکبر) بادروشمت بێت، مەزنی ئەو زاتە ڕوون بکەرەوە* پۆشاکت(دڵ و دەروونت، ڕەفتارت،هەرهەمووی) خاوێن بکە(خۆت و شوێنکەوتوانت)* بەردەوامبە لەسەر وازهێنان لە گوناە* منەتیش مەکە(بەسەر کەسدا) چاکەو بەخشینەکانت بەزۆر مەزانە لەکاتێکدا بە تەمای زیاتر بێت* هەولبدە لەبەر خاترو ڕێزی پەروەردگارت خۆگرو بەئارامبە)

٢ـ لە ڕووی قسەو گوفتارەوە هەر قسەو گوفتارێك دەکەیت بەر لەوەی بیلێت جێ بەجێی بکە، هەردەم قسەو نەرم وقسە خۆش بە.

٣ـ تا دەکرێت و دیارو بەرچاوو بە شەوق زەوق و سەلیقە بەو، گرنگی بەلەشو لارت بدە، بۆن خۆش بە، هەردەم دەم بەخەندەو پێکەنین بە .

٤ـ هەردەم موژگینی بەخش و گەشبین بە، ترسینەرو ڕەشبین مەبە.

٥ـ دەسکراوەو دەسواڵا بە قوربانی بدە بە خۆت و ماڵ ومنداڵ و سامانت بۆ گەیاندنی دینی خودای گەورە.

## بەرنامەی ڕۆژووەوان: دوای نوێژی ( عیشا ):

١ـ هەفتەی دوو ڕۆژ تەرخان بکە بۆ سەردانی خزم و کەسوکارت و دۆستانت، بەتایبەت ئەوانەی پەیوەندیان لەگەڵت پچڕاندووە.

٢ـ لەهەفتە دوو ڕۆژ تەرخان بکەبۆ بەشداری کردن لەدەرسێکی شەرعی بکەیت.

٣ـ هەفتەی ڕۆژێك هەرهەموو خێزانەکەت کۆبکەوە بۆ ئامۆژگاری کردنیان و وانەیەکی شەرعی.

**بریاری گۆڕانکاری بدە:**

بزانە تا ئێستا هەڵسوکەوت و مامەڵەت چۆن بووە لەگەڵ ماڵ و منداڵەکانت ئایا ئەو نەرم و نیانی و ڕووخۆشیەی لەگەڵ خەڵکانت هەیە هەمان مامەڵەو هەڵسوکەوت دەکەیت لەگەڵ ماڵ منداڵ و خێزانەکەت، وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێ: (( خیرکم خیرکم لأهله وأنا خیرکم لأهلي)) {بەیهەقی گێڕاویەتیەوە} واتە: (چاکترینتان چاکترین کەسە لەگەڵ منداڵ و خێزانەکانی وەمنیش چاکترین کەسم لەگەڵ منداڵ وخێزانەکانم)

# خەلاتی سێزدەهەمین

## ئەو گەنجەی لەگەڵ پێشێل کردنی مافی خودا مافی دایکیشی پێشێل کرد

با لەو مانگە پیرۆزەدا بۆ بە خۆداچوونەوەیەك لەگەڵ هەڵەو کەم و کورتیەکانی خۆمان بەرامبەر دایك و باوکمان کوێ لەم بەسەرهات و ڕووداوە بگرین، بیکەین بە وێستگەی چارەسەری و مەرهەمی خراپەو هەڵەکانمان لە ئاست دایك و باوکانمان:

ئافرەتێك وەك ئافرەتە داماوەکانی وڵاتی ئێمە دوای ئەوەی شوو دەکات بە پیاوێك بەڵام تەمەنی هاوسەر گیری لەگەڵ پیاوەکەی زۆر کورت دەبێت، دوای ئەوەی کوڕێکی لە پیاوەکەی دەبێت، پیاوەکەی کۆچی دوایی دەکات، ئەو ئافرەتە بەتەنیا لەگەڵ منداڵە تاقانەکەی بێ سەرپەرشت دەمینێنەوە، بەڵام ئەو ئافرەتە مەردە کوڵ نادات و لەو تەمەنە گەنج و لاویەتیەی خۆی بە کولە مەرگی و زەحمەتیەکی زۆر بەخزمەت کردنی خەڵك و خزمەت چی یەتی ئەو منداڵەی بەخێو دەکرد،جگە لەوەی لەقوتابخانەیەکی نزیك ماڵەکەی خۆی بوو بە بەردەست ـ خزمەتگوزار- بەڵام چ بەخێو کردن و چۆن بەخێو کردنێك هەرچی منداڵانی خەڵك هەیان بوو ئەو کوڕەی ئەو بەزیادەوە بۆی دەکرد، لەخواردن و خواردنەوەو جل و بەرگ و هەر شتێك کە پێویستی پێ بووایەو بیویستبایە بۆی دەستەبەر دەکرد، تا کاتی ئەوە هات کوڕەکەی بچێتە قوتابخانەو وەك منداڵانی بخوێنێت، ئەو دایکە دڵسۆزو بەسۆزە کوڕەکەی لەو قوتابخانە دانا کە خۆی تێیدا فەرمانبەربوو، تا لەبەرچاوی خۆی بێت وئاگاداری بێت.

ئەو کوڕە بەنازە لەناو هەموو قوتابیەکانی قوتابخانە دیارو بەرچاوبوو، لە کاتی پشووی قوتابیان و نێوان وانەکانیان دایکەکە چاوی لەو کوڕەی بوو، چونکە تاکە هیواو ئومێدی بوو بۆ دوارۆژی.

ئەو کوڕە بچوك بوو هەر لەباوەشی گەرمی دایکی گەورەبوو گەشەی کرد، بەڵام کە گەورە بوو گەیشتە قۆناغی هەرزەکاری و گەنجایەتی لەقوتابخانە چووە قۆناغی ناوەندی و دواناوەندی دایکەکەی زۆر دڵی پێوەی بەندبوو، بۆیە لەگەڵ کوڕەکەی ئەویش خۆی گواستەوە

بۆ ئەو قوتابخانەی کە کوڕەکەی دەچوو بۆ تەواو کردنی قۆناغی ناوەندی، چەندی ئەو کوڕە باڵای بەرزو گەورە دەبوو دایکەکەشی ئەوەندەی تر دڵخۆش دەبوو ئومێدو ئاواتەکانی گەورەو گەشبین تر دەبوو، بەڵام ئەو کوڕە بەپێچەوانەی دایکی بوو حەزی نەدەکرد بۆ زۆر شوێن دایکی لەگەڵی بێت، بۆیە یۆیەکەمجار بەدایکی ڕاگەیاندو ووتی بە هیچ شێوەیەك نابێت قوتابیەکانی تر بزانن کە تۆ دایکی منی، چونکە تۆ خزمەتچی و تەنها چاوێکیشت هەیە، دوایی لای قوتابیی و هاوڕێیەکانم شەرمەزار دەبم و گاڵتەم پێ دەکەن، دایکەکەش رازی بوو بە هیچ شێوەیەك خۆی دەرنەدەخست کە دایکی ئەوە، کاتێکیش پێویستی بە پارەو پوولێ هەبوایە بەنهێنی لە شوێنێکی نادیار لێی وەردەگرت بێ ئەوەی کەس بزانێت، بەڵام ڕۆژێك ئەو دایکە داماوە چاودەگێڕێت لەناو قوتابخانە کوڕەکەی بەرچاوناکەوێت بۆیە زۆر پەرێشان دەبێت و خۆی پێ ناگیرێت، بەهەڵەداوان دەچێتە ناو قوتابیەکان دەڵێت: کوا کوڕەکەم بۆچی دیار نیە؟ چی بەسەر هاتووە؟ لەناکاو کوڕەکەی بەدەردەکەوێت! کەئەمە دەبینێت زۆر ناڕەحەت دەبێت و، زۆر توورە دەبێت لەدایکەکەی بەڵام خۆی بێ دەنگ دەکات،

تا ئەو کاتەی دەچێتەوە ماڵ، هەر کە دەچێتەوە ماڵ دایکەکەی بەچاوێکی پڕ لەفرمێسكو قوڕگی گریانەوە دەست دەکات بەپاڕانەوەو پۆزش هێنانەوە بەڵام ئەو کوڕە سەرەڕۆیە هیچ قسەیەکی لێ وەرناگرێت و چی خراپ و نا شایستەیە بەو دایکەی دەکات و، دەڵێت هەرگیز ناچمەوە قوتابخانە، دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر رازی دەبێت بچێتەوە قوتابخانەو درێژە بە خوێندنی بدات، ئەو دایکە دڵسۆزو بەسۆزە هەموو ڕەنج و ماندووبونێکی دەچێشت لەپێناو پێگەیاندنی کوڕە تاقانەکەی، بۆیە کە کوڕەکەی گەیشتە قۆناغی دواناوەندی و کۆلێژ خەرجی کوڕەکەی زیاترو زۆرتر ببوو تەنها موچەکەی بەشی نەدەکرد، بۆیە ناچاربوو دوای دەوامی قوتابخانەکەی ئیش و کارو خزمەت چی یەتی دەکرد تا کوڕەکەی لە کۆلێژەکەی دەرچوو بڕوانامەی بەدەست هێناو دواییش دامەزرا، بەڵام ئایا ئەو دایکە داوای لە کوڕەکەی کرد تۆڵەی ئەو هەموو ڕەنج و تێکۆشانەی ساڵانی ڕابردووی بۆ بکاتەوە! نەخێر.

بەڵکو ووتی: کوڕی شیرین و تاقانەم موچەکەت کۆ بکەوە سەریەك و هەموو خەرجیت با لەسەر من بێت تا ژنێك دەهێنیت. دوای کۆ کردنەوەی پارەی ژنهێنان دایکی داماو هەر ئافرەت وکچێکی بۆ دەست نیشان دەکرد بە بیانوویەك ڕەتی دەکردەوەو رازی نەدەبوو تا بۆ خۆی کچێکی دیاری کرد، هەر چەندە دایەکەی ووتی کوڕی خۆم ئەو ئافرەتەو ئەوماڵەو هاو شێوەی ئێمە نینەو لەگەڵ ئێمە ناگونجێن، ئەو کوڕە سەرە ڕۆیە ووتی ئەگەر ژنبهێنم هەر ئەو کچە دەهێنم ئەگینا جارێکی تر باسی ژنهێنانم لەلا مەکە، دایکی کە زانی هیچ سوودی نیە بۆیە ئەویش بە ناچاری ڕازی بوو، ئەو کچەی بۆ هێنا کوڕەکەی و بوکەکەی هەردووکیان فەرمانبەر بوون، هەرچی ئیش و کارو پێویستی دەرەوەو ژوورەوە هەبوو لەسەر ئەو دایکە بوو، بەڵام هێشتا هەر لێی رازی نەبوون، ئەو بووکەی چەندین بیانووی ناڕاست و دروستی پێ دەگرت و دوای کێشەو گیرو گرفتێکی زۆر کوڕەکەی بە ڕاشکاوی ووتی نامانەوێ لەگەڵ پیرەژنێکی یەکچاوی وە تۆ بژین و ماڵمان جودا دەکەینەوە، ئەو بێ ویژدانە پیرە دایکی بێ کەسی بەتەنها لە ماڵێکی ساردوسڕ بەجێ هێشت، بەڵام ئەو دایکە دڵسۆزو کانیاوی بەزەییە خۆی پێ نەدەگیرا ناوە ناوە سەردانی کوڕەکەی هەر دەکرد تا ڕۆژێك بوکەکەی پێی دەڵێت: تۆ هەر واز لە ئێمە ناهێنت بۆیە ئێمە ناچارین لەدەست تۆ ئەو وڵاتە جێ بهێڵین، دوای ماوەیەك ئەو کوڕە لەگەڵ خێزانەکەی دەچنە وڵاتێکی تر ئەو دایکە ئۆقرەی نامینێ و زۆر پەریشانی کوڕەکەی دەبێت دوای بەدواداچوون و پرسیارکردنێکی بێ ووچان و کۆڵنەدان ناونیشانی کوڕەکەی دەدۆزێتەوەو بەڕێ دەکەوێت بۆ ماڵی کوڕەکەی،پاش خەرج کردنی پارەیەکی زۆرو ماندووبوونێکی بێ ئەندازە ماڵی کوڕەکەی دەدۆزێتەوە، لە دەرگای ماڵەکەیان دەدات و یەك دوو منداڵی تازە پێگەیشتوو دەرگاکە دەکەنەوە، پیرەژن دەڵێت: ماڵی فڵانە ناوی کوڕەکەی دەڵێت منداڵەکان دەڵێن: بەڵێ هەوە. دەڵێت: من داپیرەی ئیوەم و دایکی باوکتانم . کاتێ منداڵەکان دەچنەوە ژوورەوەو بەدایکیان دەڵێن، دایکەکەیان دەڵێت: نەخێر وانیە درۆ دەکات باوکتان دایکی نەماوە بە خۆشی دێتە بەر دەرگاکە چەندین قسەی

ناشیرینی پێ دەڵێت دەری دەکات، هەر چەندی دەپاڕێتەوە دەڵێ: بەس لێبگەڕێ بێمە ژوورەوە تا کوڕەکەم دێتەوەو ئەو جارەش ببینم رازی نابێت و بەدەری دەنێت، بەڵام ئەو دایکە هەر ناڕوات لە شوێنێکی دووری ماڵەکە چاوەڕوان دەبێت تا کوڕەکەی دێتەوە، کە کوڕەکەی دێتەوەو دەگاتە بەر دەرگا دەچێتە لای و دەڵێت کوڕی خۆشەویستم هاتوومە بۆ دواجار تێر بتبینم، ئەگەر مۆڵەت بدەن ئەو شەو لاتان بم کوڕەکەی دەڵێت: ئێمە لەبەر تۆ ڕامان کردوهاتووینە ئێرە، دواییش منداڵەکانمان تۆ ببینن دەترسن، بۆیە چۆن هاتی ئەو هاش بگەڕێوە شوێنی خۆت.

ئەو دایکە بەڕە بەهەناسەساردی گەڕایەوە بێ ئەوەی بتوانێت پڕ بەدڵ کوڕە تاقانەکەی ببینێت، بۆ جارێکی تر بەبێ کەسی و بەتەنیایی لەناو خانووە بچوکەکەی ژیانی بەسەر دەبرد، دوای ئەو کاتەی کە خودای بۆی نوسی بوو، توشی نەخۆشیەك دەبێت و کۆچی دوایی دەکات، بەر لەوەی بمرێت نامەیەك بۆ کوڕەکەی دەنوسێت ولای کەسێك جێی دێڵێت دەبێت ئەو نامە چی تیا نوسرابێت؟!

نوسی بووی: کوڕی خۆم هەموو ئاواتم ئەوە بوو گەورە بی و بە بەژن و باڵایەکی جوان بتبینم و لەژێر سێبەری تۆ ئەو تەمەنەی ماوبوو گوزەر بکەم، ئێستاش پەردەت بۆ لەسەر ئەو یەك چاویەم لا دەبەم کەبە هۆیەوە ببوومە مایەی شەرمەزاری بۆ تۆو خێزانەکەت کوڕەکەم دەزانی چاوەم بۆ نەماو لەدەستدا کاتێ بچوك بووی ڕات کرد کەوتی چاوێکت کوێرە بوو منیش ئەو چاوەی خۆم بەخشی بە تۆ تاتۆ یەکچاو نەبی و بەیەکچاوی دونیا نەبینی ڕۆڵە گیان.

دەبا لەو مانگەدا کە مانگی دڵنەوایی و دڵنەرمی یە بزانین تا ئێستا چۆن بووینە لەگەڵ دایك و باوکماندا، ئەگەر باش وچاك بووینە سوپاسی خودای لەسەر بکەین، ئەگەر بەپێچەوانەشە باسەرزەنشت و لۆمەی خۆمان بکەین.

## * بزانەو ئاگادابە:

ا- رەزامەندی خودای گەورەو میهرەبان پەیوەست و بەندە بەرەزامەندی دایك و باوك: پێغەمبەری نازدار(ﷺ) دەفەرمووێ: ((رضا الله في رضا الوالدين وسخطه في سخطهما))

ب - هەموو گوناهو تاوانێك بۆی هەیە خودای گەورە سزاو تۆڵەكەی دوا بخات بۆ رۆژی دوایی، تەنها ئازاردان و ئەشكەنجەدانی دایك و باوك نەبێت خودای گەورە هەر زوو لە دونیادا تۆڵەو سزاكەی وەردەگرێتەوە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێ: ((بروا آباءكم تبروا أبناؤكم)) واتە: (چاكە بكەن لەگەڵ باوكەكانتان، منداڵەكانتان لە دوا رۆژ چاكەتان لەگەڵ دەكەنەوە)

ج - ئافرەت و خێزانی باش و خواناس دین و ژینە بۆ مرۆڤ، بەپێچەوانەوەش ئافرەتی خراپ و خوانەناس شەرمەزاری دونیاو دوارۆژە، بۆیە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرمووێ: ((الدنيا متاع وخير متاعها المرأة الصالحة)) واتە: (دونیا خۆشی یە لەهەموو چاكترین خۆشی دونیا ئافرەتی چاكە)

د - هاوسەنگی راگرتن لەنێوان و دایك و خێزان رەوشت و ئاكاری پیاوی ژیرو تێگەیشتوو خواناسە.

ه - بیر لە رەنج و ماندووبوونی تەنها شەوو رۆژێكی دایك و باوكت بكەوە، لەو كاتەی بچوك بووی و تۆیان بەخێو دەكرد.

و- بیربكەوە ئەگەر نۆ مانگ شتێك بخەنە ناو گیرفانت، بەردەوام بەشەوو رۆژو هەڵی بگری چەند ناخۆش و زەحمەتە.

ز- ئافرەتی پیاومردوو كە ئارام دەگری لەسەر بەخێو كردن و پێگەیاندنی منداڵەكانی، خۆشەویست(ﷺ) دەفەرمووێ: (شەوی میعراج كاتێ منیان برد بۆ بەهەشت، ئافرەتێك لەگەڵ من بەیەكەوە چووین بۆ بەهەشت و ووتم: ئەی جوبرائیل ئەمە كێ یە؟ ووتی: ئافرەتێكی پیاو مردووەو ماوەتەوە لەسەر منداڵەكانی تابەخێوی كردن پێی گەیاندن)

ح ـ هەندێ كەس پاساوو پۆزش دەهێننەوە بۆ ئەشكەنجەو ئازاردانی دایك و باوكانیان بۆ نمونە دەڵێن: قسەیان رِەق و ناخۆشە، من چوویمە لایان بەڵام ئەوان زویرن و چاك نابنەوە، پیسن، بەمیوانن، بە ئەركن، ... هتد

بۆ هەموو ئەو قسە بێ بنەمایانە دەڵێم: چاكەو خێرو پاداشت بەدەست هێنان بۆ دوارِۆژو ناوو دەنگی بەرزو باش لەدونیا پێویستی بەقوربانی دان هەیە، قوربانی دان بە لەش و دڵ و دەروون و ماڵ و سامان هەیە.

## * چۆن بەچ شێوەیەك دڵ و دەروونی دایك و باوكمان خۆش بكەین:

١ـ چۆن گاڵتە گەپ و قسەی خۆش و لەگەڵ خێزان و منداڵەكانت دەكەیت، بزانە دایك و باوكت زیاتر پێویستیان پێیەتی.

٢ـ ماڵ و سامان هۆكارێكە بۆ راكێشان و كەمەندكێش كردنی دڵی كەسی بەرامبەر كەوابوو دایك و باوكت لەنزیك ترین كەست بێ بەش مەكە، یارمەتیان بدە نەوەك یارمەتی بەڵكو وەك جێ بەجێ كردنی ئەركی سەر شانت، ئەگەر پێویستیشیان بەیارمەتی تۆ نیە لە رِێگای بەخشینی دیاری خەڵات پێیان بدە، حەزو ئارەزووەكانیان بۆ جێ بەجێ بكە.

٣ـ زوو زوو سەردانیان بكە، ئەگەر بۆ ماوەیەكی زۆر كەمیش بێ، ئەگەر هەرنا بە تەلەفۆن بەسەریان بكەوەو لێیان بپرسە.

٤ـ گەشت پێ كردنیان و سەردانی پێ كردنیان لەگەڵ خۆت سەردان و سەفەریان پێ بكەی بێ ئەوەی ئەوان داوات لێ بكەن بەڵكو بەخۆت برِۆ بەدوایانداو سەردانی خزمو كەسانیان پێ بكە.

٥ـ لە گەشت و گوزارەكانت بێ بەشیان مەكەو لەگەڵ خۆتیان ببە.

* كەبانگدرا وەڵامی بانگەكە بدەرەوەو، دوعای وەسیلە بكە، وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێ: كەبانگ بێژ بانگی فەرموو ئیوەش وەك بانگ بێژ ووشەی بانگەكە بڵێنەوە پاشان بڵێن: ((اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة آت محمدا الوسيلة

والفضيلة وابعثه المقام المحمود الذي وعدته)) ئەوەی ئەم دوعایە بكات لەرۆژی دوایی تكا(شەفاعەت)ی منی بۆ حەلال دەبێت)

* زیكری بێ ئەوەی هیچ قسەیەك بكەیت و، شێوەی دانیشتنی خۆت بگۆڕی (١٠) دە جار بڵێ: ((لا إله إلا الله، وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد يحي ويميت بيده الخير، وهو على كل شيء قدير)) بەهەر جارێك (١٠) دە خێری بۆ دەنوسرێت و، (١٠) دە گوناهی لەسەر دەسرێتەوەو، (١٠) دە پلە بەرز دەبێتەوە).

بەرنامەی رۆژووەوان: بۆ كاتی بەربانگ:

١ـ بەلای كەم (٤٥) چل و پێنج خولەك بەر لەنوێژی (مەغریب) لەمزگەوت ئامادەبە.

٢ـ پێش نوێژی (مەغریب) زیكرەكانی ئێوارە بخوێنە، نەوەك دوای نوێژ فریای نەكەوێت و لەبەر سەرقاڵی لەبیری بەكەیت.

٣ـ ئینجا ئەگەر مزگەوت پێویستی بەخاوێن كردنەوەو شووشتن هەبوو بەشداری بكە لەوخێرە، چونكە مارەیی بەهەشتەو گرانترین خێرو كردەوەیە لەسەر تەرازووی خێر.

بڕیاری گۆڕانكاری بدە: سەرنجێكی ناوماڵ و كەل و پەلەكانی ناوماڵی خۆت بدە و ئینجا بزانە: چەند شت لەناو ماڵەكەتدا هەیە كەدروست نیەو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی رازی نەبووەو بەربەستی هاتنی فریشتەكانی خودای گەورەنە: وەك پەیكەرو وێنەو ڕاگرتنی سەگ لەناوماڵ، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرمووێ: (فریشتەكان ناچنە ماڵانێك كە وێنەو سەگی تێدا بێت).

**تێبینی:**

اـ مەبەست لەوێنەو پەیكەر وینەو پەیكەری گیان لەبەرانە دروست نیە، بەڵام وێنەو پەیكەری سروشتی ئاساییەو دروستە .

ب ـ سەگ ڕاگرتن لەناواڵ دروست نیە، مەگەر بۆخاوەن ئاژەڵ و ڕاوكردن بێت دروستە.

# خەلاتی چواردەهەمین

## بەڵگەی خۆشەویستی پێغەمبەرەکەت چی یە؟

ئەمجارەش لەگەڵ ئێوەی ڕۆژووەوانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزو بەقەدر بۆ گۆڕانکاری دروست کردن لە دڵ ودەروونمان و نۆژەن کردنەوەی بڕواکەمان و بەڵێن نوێ کردنەوەمان بۆ پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)، ئەم بەسەرهات و چیرۆکەتان دەخەمە بەردەستی ئێوەی بەڕێزو سەنگین:

دەگێڕنەوە بازرگانێکی زۆر بەناوبانگ و ناوداری وڵاتێکی موسڵمانان کەداهات و سامانێکی بێ ژمارەو بێ ئەندازەی هەبووە لە کۆشك و تەلارو دوکان و پارەو پول سوارێکی زۆرنایاب ودەگمەن و پارەو پوول و سامان...هتد

بەڵام ئەو پیاوە دوای ئەو هەموو نازو نیعمەت و خوداپێداوییەی لەناکاو توشی تاقیکردنەوەیەکی گەورەو زۆر سەخت دەبێت، ئەویش لەکاروانێکی بازرگانیدا زەرەرو زیانێکی ئەوتۆ دەکات کە بە هەموو ماڵ و سامانەکەی لەبن دەرنایەت، بۆیە ناچار دەبێت هەرچی یەتی لەپارەو پوول و دوکان قەرەبووی ئەو زەرەرو زیانەی هەر بۆ ناکرێتەوە لە دواییدا خانوەکەی کەسابات و سێبەرە بۆ ماڵ ومنداڵکانی ئەویش دەفرۆشێت و، دەکەوێتە ژێر رەحمەت و ئەم و ئەو، ئەم پیاوە بازرگانە بەناوبانگ و ناودارە کە خەڵکانێکی زۆری ئەو شارەی ئەو لەژێر دەستی ئەودابوون و کرێ گرتەی ئەو بوون و چەندین هەژارو نەداری ئەو شارەی ئەو ئەو یارمەتی دەدان، چەندین منداڵی بێ باوك و دایكە هەتیو ئەو بژێوی ژیانیانی گرتبووە ئەستۆی خۆی، بەڵام ئێستا ئەو کەوتۆتە بەر رەحمەتی ئەم و ئەو لەژێر سێبەری خەڵکاندایەو چاوی لەهاوکاری و یارمەتی خەڵکی شارەکەیە، ئەوەی وای کرد کەئەو پیاوە هەندێ بەرگە بگرێت پاداشتی خەڵکی ئەو شارەی بوو بەرامبەر چاکەو خێرو یارمەتیەکانی کەبەهەموو شێوەو شێوازێك دەستی خۆی نەدەقوچاند لەئاست خێرو کاری چاکە، بەڵام گەورەیی زەرەرو زیانەکەی بەشێوەیەکی وابوو کەبەکەس ڕاست نەدەکراوە، ئەو پیاوە بەناو ساڵدا کەوتبوو بۆیە دڵە لاوازو شکاوەکەی تەنها چەند کاتێکی کەم بەرگەی ئەو بەسەرهات و

كارەساتە گەورەی گرت و دوای ماوەیەك نەخۆش كەوت نەخۆشیەكەشی نەخۆشی كۆچ و وەفات كردنی بوو وەفاتی كرد، لەدوای خۆی خێزانێك و دووسێ منداڵی بچوكی بەجێ هێشت ئەو ئافرەتەی ئەو ئافرەتێكی دیندارو خوانـاس و شـارەزابوو حـەزی نـەكرد دوای مردنـی پیاوەكەی بەچاوژێری لەو شارەدا بژی نەوەك ببێتە مایەی سووكبون بۆپیاوەكـەی بۆیـه ئـەو شارەی بەجێ هێشت و بەخۆی و منداڵەكانی ڕوویان لەشارێكی تر كرد كە چوونە ناو ئەوشارە هیچ شوێنێكی ئەوشارە شارەزا نەبوو بۆیە یەكـەم شـوێن كـە بـیری كـردەوە ڕووی تێبكـات مزگەوتبوو منارەی مزگەوتێكی لەدوور بینی بەرەو مزگەوتەكە چوو، چـووە لای مامۆسـتای مزگەوت وساڵای بارو گوزەرانی خۆی بۆ باس كرد، مامۆستاكەش پێی ووت: من بـڕوات پـێ ناكەم تادوو شایەدم بۆ نەهێنیت شایەدیت بۆ بدەن كەتۆ ڕاست دەكەی، ئەو ئافرەتە كەئەمەی بیست فرمێسك بە چاوەكانیدا هاتە خوارو ووتـی: مامۆسـتا گیـان مـن ئـافرەتێكی بیـانیم خەڵكی ئەو شارەی ئێوە نیم كەس ناناسـم و كـەس نامناسـێت شـایەد لـەكوێ بێـنم! بـەڵام سوودی نەبوو بۆیە بەناچاری ڕۆیشت بەناو ئەو شارەدا گەڕاو سـووڕا هـیچ شـوێنێكی دەسـت نەكەوت تائێوارەیەكی درەنگ كەنزیكبوو شەوی بەسەردا بێت ڕێی كەوت بـە پەرسـتگایەكی ئـاگر پەرسـتان ـ دیـارە ئـەو شـارە ئـاگر پەرستیـشی تیـابووە ـ چـووە لای ئـەو زانایـەی ئاگرپەرستان و باروگوزەرانی خۆی بۆی بـاس كـردو ووتـی: تـا بـەیانی بـڕۆ ژوورەوە لەگـەڵ منداڵەكانی من بژی، ئەو ئافرەتە خواناسە كاتێ چووە ناوخێزانەكەی ئەو پیـاوە ئاگرپەرسـتە كاتی مەغریب ئێوارەبوو نەگەیشتە كاتی نوێژی خەوتنان ـ عیشاـ كاتی پیاوەكە دەگەڕێتەوە منداڵەكانی دەبینێت هەموویان چاوبە فرمێسك و مات و مەلول سەریان لەبەر خۆیـان نـاوەو دانیشتوون، كاتێ دەپرسێت چی بووەو چی قەوماوە منداڵەكانی دەڵـێن وەرە دابنیـشە كـوێ بگرە كاتێ ئەویش دادەنیشێت و كوێ دەگرێت ئەویش دەبێتە موسڵمان.

هەرئەو شەوە مامۆستای مزگەوتەكە كەئەو ئافرەتەی نەحەواندەوەو بـەدەری نـا، خـەوی بینی لە گۆڕەپانی حەشردابوو كە كەس فریای كەس ناكەوێت تـەنها پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) هاواری (أمتي ،أمتي) بۆیە مامۆستاش پەنا دەباتە بەر پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) تا بەهانای

بێت و رزگاری بکات لەو رۆژە ڕەش و ناخۆشە، لەگەلْ لێشاوی خەلْکەوە دەچێتە خزمەت پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بەلاّم پێغەمبەری خودا(ﷺ) چەند جار ڕووی لێ وەدەگێڕێت و پشتی تێدەکات، ئەویش دەچێتە بەرامبەری و دەلێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) منیش ئوممەتی تۆم؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: دووشایەدم بۆ تا شایەدیت بۆ بدەن کەتۆ ئوممەتی منی ووتی ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەم ڕۆژە ڕەش وناخۆشە شایەد لەکوێ بێنم فەرمووی: چۆن داوای شایەدیت لەو دایکە هەتیوە کرد ئێمەش ئەمڕۆ داوای شایەدی لەتۆ دەکەین.

کاتێ بەیانی داهات ئەو مامۆستا بەڕێزە: بەو شارەدا گەڕاو سوڕاوە تا ئەو ئافرەتەی دۆزیەوە لە مالّی ئاگر پەرستەکە چووە لای و پێی ووت: ئەم ئافرەتەم پێ بدە. ووتی: نای دەم بە هیچ کەسێك دەزانی چ سوودێکم لەو ئافرەتە کردووە. ووتی: هەرچی دەتەوێت لە مالّی دونیا داوا بکە پێت دەدەم بەس ئەم ئافرەتەم پێ بدە .ووتی: ئەگەر هەر هەموو دونیام پێ بدەیت ئەو ئافرەتەت پێ نادەم، ئەو سوودو قازانجەی ئێمە لەئەومان کردووە لەهیچ کەسی ترمان نەکردووە. ووتی: ئەو سوودو قازانجەی لەو وەردەگریت لە ئێمە وەربگرە بەرامبەربە پێدانی ئەو بە ئێمە ووتی: تا ئێستا نەتۆو نەکەس لە ئێوەی موسلّمان نەتان توانیوە ئەو سوودەی ئەوئافرەتە بە ئێمەی گەیاند پێمان بگەینن تازەش هەرگیز ناتوانن.ئەو مامۆستا بەڕێزە کە ئەمەی بیست سەری سوڕما پرسی: پێم نالێیت ئەم سوودو قازانجە چی یە کە ئێوە لەم ئافرەتەتان کردووە؟! ووتی: ئەم ئافرەتە لێ نەگەڕا شەو بخوین تا هەموومانی کردە موسلّمان ئایا ئێوە چەندین سالّە واتان پێکراوە؟!

ئەوەی بیستتان بەسەهات و ڕووداوێکە جێگای سەرنج و تێڕامان و بیرکردنەوەیە:

بزانە خۆشەویستی بەلْگەو نیشانەی هەیە، بەلْگەو نیشانەی تۆ چی یە بۆ خۆشەویستی پێغەمبەرەکەت (ﷺ)؟

ئامادەین لەپێناو خێزان و منداڵ و سامان و دونیاو جوانیەکانی دونیا هەموو قوربانیەك بدەین زۆرجار لە پێناوی پارێزگاری کردن لەخزم و کەس و ماڵ منداڵ و خوشك وبراو یا

ماڵێکی کەمی دونیا دەستمان داوەتە چەك و ئامادەبوینە لە پێناوی ئەو شتانەدا خۆمانی لەسەر دابنێین بکەینە قوربانی، بەڵام ئایا تۆ جارێك لەجاران نێو چاوانت گرژبووەو تورە بوویت لەپێناوی سوکایەتی کردن و قسەووتن بە خودای گەورەو پێغەمبەرەکەی و قورئان و دروشمەکانی ئیسلام؟.

## *بەڵگەکانی خۆشەویستی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەمانەن:

ا- بڕوا هێنان پێی بڕوا بوونێکی تەواو دامەزراو لەسەر بنچینەی زانست و زانیاری قورئانی پیرۆزو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ).

ب - خۆشارەزا کردن لە هەموو لایەن بوارەکانی ژیانی بەتێرو تەسەلی و تەواوی.

ج - پێغەمبەری خودای گەورەت لا خۆشەویستتر بێت لەدایك و باوك ومنداڵ و خێزان و ماڵ و هەموو شتە گرانبەهاکان و دەسکەوتە بەنرخەکانی ژیانت تەنها لە خودی خۆشت خۆشترت بوێت، ئەگەر نا بزان بڕواکەت ناتەواوو ئەو بڕوایە نیە کەخودای گەورەو پێغەمبەرەکەت داوای کردووە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾ {سورەتی **التوبة**: ئایەتی٢٤}.

واتە: (ئەی موحەممەد(ﷺ) پێیان بڵێ: ئەگەر باوو هاوسەرانتان و عەشرەت و هۆزتان و ماڵ و سامانێك کە بەدەستتان هێناوە، یاخود بازرگانیەك کەدەترسن لەشکان و بێ بازاڕی رووی تێبکات و خانووبەرە و کۆشك و تەلارێك کە حەز دەکەن لێتان تێك نەچێت دڵخۆشن پێی، لاتان خۆشەویستترو نازدارتر بێت لە خواو پێغەمبەرەکەی و جیهاد و تێکۆشان لە پێناو رێبازی ئەو زاتەدا دە ئەوە چاوەڕوان بن، هەتا خوای گەورە دێت بە فەرمانەکانیەوە(تۆڵەتان

لێ دەسێنێت)، خوای پەروەردگاریش هیدایەت و ڕێنموونی قەومی یاخی و لەسنوور دەرچوو نادات).

پێشەوا گەورەمان عومەری کوڕی خەتتاب بە پێغەمبەری سەروەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ئەی پێغەمبەری خودا من تۆم لە هەموو شتێك زیاتر خۆشتر دەوێت تەنها لە خودی خۆم نەبێت پێغەمبەری خۆشەویست فەرمووی: نەخێر ئەی عومەر دەبێ لە خۆشت زیاتر منت خۆش بوێت ئینجا بڕواکەت تەواوە پێشەوا گەورەمان عومەری کوڕی خەتتاب (خودا لێی ڕازی بێت) فەرمووی: ئێستا من تۆم لەخودی خۆشم زیاتر خۆشم دەوێیت پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) فەرمووی: ئێستا بڕواکەت تەواوە ئەی عومەر.

د ـ جێ بەجێ کردنی سوونەتەکانی لە بچوکترین سوونەتەوە تا گەورەترین سوونەتی زێرینی، دەستی پێوە بگری و شانازی پێوە بکەیت.

هـ ـ ئەو شتانەی ئەو پێی خۆشبووە تۆش پێت خۆش بێت و حەزی لێ بکەیت، هەر شتێکیش ئەو پێی ناخۆش و دڵتەنگبووە تۆش پێت ناخۆش و دڵتەنگ بی.

و ـ زۆر سەڵاوات لێ دان چونکە سەڵاوات نیشانەو بەڵگەی وەفاداری و خۆشەویستی ئومەتەکەیەتی بۆ ئەو.

## * لە ڕوانگەی ئەم پرسیارانەوە خۆت هەڵبسەنگێنە بزانە ئاستی خۆشەویستیت چەندە بۆ سەروەرەکەت:

١ـ ئایا ئەگەر یەکێ لە ئەندامانی خێزانەکەت یا خزم و کەسەکەت دژ بەپێغەمبەرو ئایینەکەی بی، کامیان هەڵدەبژێریت، خۆشەویستی کامیان زاڵترو زۆرترە؟

٢ـ برای گەنج و لاوی بەڕێزم لەماوەی ساڵانی خوێندنت چەند کتێبی ئەستوورو زەبەلاحت لەم بۆ ئەمسەر خوێندو تەواو کردو لەبەریانت کرد، تەنها لە پۆلی دوازدەم چەند کتیبی ئەستورو پێناسەو یاساو هاوکێشەو ژیاننامەی کەسایەتی ناودارت لەبەرکرد، ئایا تائێستا خۆت بەکەمتەرخەم و شەرمەزار نازانیت بەرامبەر ئەو پێغەمبەرە کە تائێستا

قورئـانی پـیرۆزت خـەتم نـەکردووەو کتێبێکـی تـەواوت لەسـەر ژیاننامـەو سـوونەتەکانی نەخوێندۆتەوە.

٣ـ بزانە ناوو ژیاننامەی چەند یاریزان و گۆرانی بێژو کەسانی نـاودارت لەبـەر کـردووە، ئەی چەند هەولّت داوە بۆ خۆشارەزا کردنت لە ژیاننامەی ئەو خۆشەویستە.

٤ـ کاتێ ئیش و کارێك دەکـەیت یاکـاتێ ئۆتۆمبێلێـك دەکـڕی یـا خانوویـەك دروسـت دەکەیت پرس وڕا بەچـەند کەسـی پـسپۆڕو شـارەزا دەکـەیت، ئایـا قـەت بـیرت کردۆتـەوە کەهەولّبدەی بزانی پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) چۆن هاوشێوەی ئەم کارەی تۆی کـردووەو تـۆش وەك ئەو بیکەیت تا سوونەتەکانی لەم کارەدا جێ بەجێ بکەیت، بۆ نموونە: پێغەمبەری خودا نۆ(٩) خێزانی هەبووە کاتێ کەتۆش خێزان پێـك دەهێنیـت بزانـە پێغەمبـەری خۆشەویـست (ﷺ) چۆن داخواز کردووە، چۆن مارەی بڕیوەو، چۆنی گواستۆتەوە، ئایـا خێزانەکـەی بردۆتـە سالۆن؟! ئایا بۆ گواستنەوەکەی چۆتە نادی؟!

٥ـ ئاگاداربـە پێغەمبەرەکـەت(ﷺ) لـەکاتی دروسـت کردنـی قـەلاّی پارێزگـاری نوێـژ کەمزگەوتە پیرۆزەکەی بوو لەشاری مەدینەی پیرۆز هـەرگیز نوێـژی بەتـەنها نـەکرد، بـەلّکو هەموو نوێژەکانی بەکۆمەڵ ئەنجامدا، تا کاتی نەخۆشیەکەی کەبەهۆیـەوە وەفـاتی فـەرموو، هەولّی چونە مزگەوت و نوێژی بەکۆمەلّیدا، ئەوپـەڕی هـەوڵ و کۆشـش دەکـات، وەك خـاتو عائیشەی دایکمان دەگێڕێتەوەو دەفەرمووێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ نەخۆشـیەکەی زۆر سەخت و گران ببو لەبەر ئێش و ئازاری لەهۆش خـۆی دەچـوو فـەرمووی: خـەلّکان نوێـژیان کردووە؟ منیش ووتم: نەخێر چاوەڕوانی تۆ دەکەن، ئـەی پێغەمبــەری خـودا(ﷺ). فـەرمووی هەندێك ئاوم بۆ لە تەشتێك بکەن، ئاوەکەمان بۆی دانا دەسنوێژی شوشت و کە هاتەوە سـەر جێگاکەی جارێکی تر لە هۆش خۆی چۆوە بەئاگا هاتەوە فەرمووی: خەلّکان نوێژیان کردووە؟ ووتم: نەخێر چاوەڕوانی تۆ دەکەن، ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ). فەرمووی هەندێك ئاوم بۆ لـە تەشتێك بکەن، ئاوەکەمان بۆی دانا دەسنوێژی شوشت و کە هاتەوە سەر جێگاکەی جـارێکی

تر لە هۆش خۆی چۆوە بەئاگا هاتەوە فەرمووی: خەڵکان نوێژیان کردووە؟ ووتم: نەخێر چاوەڕوانی تۆ دەکەن، فەرمووی هەندێ ئاوم بۆ تەشتێك بکەن، ئاوەکەمان بۆی دانا دەسنوێژی شوشت و کە هاتەوە لەهۆش خۆی چۆوە ئەم جارەش فەرمووی: خەڵکان نوێژیان کردووە؟ ووتم: نەخێر ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) موسڵمانان لەمزگەوت ماونەتەوە چاوەڕوانی پێغەمبەری خودا دەکەن تا نوێژی عیشایان بۆ بکات ئینجا پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە بێ هیوابوو لەوەی کە بۆ خۆی ناتوانێت نوێژەکەیان بۆ ئەنجام بدات فەرمووی: بڕۆن فەرمان بە ئەبوبەکری بکەن بانوێژ بۆ موسڵمانان بکات.

تۆش دەڵێی پێغەمبەرم خۆش دەوێت بەڵام ئایا وەك ئەو ڕشتی لەسەر نوێژی بە کۆمەڵ؟

## بەرنامەی کاسبکارو پیشەداران لەو مانگە پیرۆزەدا:

١ـ هەوڵبدە ئیش و کارەکەت هەندێك کەم بکەیتەوەو ئاسان بەکەیت.

٢ـ ماڵت زۆر ببەخشە.

٣ـ ئەو پارەو پوول و خێرانەی دەی کەیت بەشێوەی پڕۆژە بیبەخشە.

٤ـ ڕووت خۆش و گەشبین و کراوەبە، بەتایبەت لەگەڵ شاگردو کرێکارو ئەو کەسانەی ئیش و کاریان بۆ دەکەیت.

٥ـ زۆر زیکرو یادی خودای گەورە بکە.

٦ـ هەر چەندی ئیش و کارەکەت زەحمەت و گران بێت نابێت هەر لەسەرەتاوە بەڕۆژوو نەبیت، بەڵکو دەبێت شەو نیەت بهێنیت و پارشێو هەڵبستیتەوەو بەڕۆژوو ببیت تا ئەو کاتەی ماندووبەتی هیلاك و پەرێشانت دەکات ئەو ڕۆژووەکەت دەتوانی بشکێنیت بەبێ ئەوەی گوناهبار ببیت.

## بریاری گۆڕانکاری بدە:

* سەرژمێریەکی پارەو پوول و ماڵکەت بکە بیرێك بکەوە لەو ماڵەی بەدەستت هێناوەو پەیدات کردووە، هەرچی حەرامە تۆبەی لێ بکەو بیبەخشە، ئینجا زەکاتی ماڵەکەت بەتەواوی بدە.

* تۆبە بکەو پەشیمانی دەربڕە لە: بێ بەڵێنی، کاری ساختە، وەرگرتنی قازانجی بێ ئەندازەو کرێی زۆر، فێڵکاری، درۆ.

# خەلاتی پازدەهەمین

## گەنجان بوکێکی ڕازاوە چاوەڕوانتە

ئیبن و نەحاس لە کتێبەکەی خۆی بەناوی(مصارع الأشواق) لە سەرکردەیەکی پاڵەوانـەوە بەناوی(ئیبن و قودامە) دەفەرمووێ سەیرترین ڕووداوو بەسەرهات لەشەڕو جەنگەکان کـەبینی بێتم بەسەرهات و ڕووداوی دایك و کوڕێکی گەنجە کەهەرگیز لەیادی ناکەم: جارێکیان لەگـەڵ کۆمەڵێك بە مەبەستی جەنگ وغەزا دەرچووین بۆ شاری (ریقە)ـ کەشارۆچکەیەکە لە نزیـك زێی فورات ـ، تابجەنگین لەگەڵ هەندێ لە بێباوەڕەکانی سەر سـنوورەکەی ئـەو شـارە، کـاتێ گەیشتمە (ریقە) چەند ووشـترێکم بـۆ بـارکردنی چـەکەکانمان، وەدەسـتم بـە قـسەکردن بـۆ موسڵمانەکان لە مزگەوتەکانی هانم دەدان بۆ غەزاو ماڵبەخشین لەپێناوی خـودای گـەورە بـۆ سەرخستنی ئیسلام و موسڵمانان، لە چەند مزگەوتێك بەم شێوەیە قسەم بۆ خەڵکەکەی کردو دوایی کە شەوداهات خانوویەکم بـە کـرێ گرتبـوو تاشـەو تێیـدا بحەوێمـەوە، کاتێـك شـەو درەنگبوو لە دەرگادرا، زۆرم پێ سەیربوو لەم کاتەی درەنگی شەو لەدەرگا بدرێت، چونکە لەو شارە کەس من ناناسێت، دەبێ کێ بێت بەم شەوە درەنگـە لـەدەرگا بـدات، بەترسـەوە چـوم دەرگاکەم کردەوە، کە دەرگاکەم کـردەوە ئـافرەتێکی پـاك و بێگـەرد چـارۆکێکی لـە خـۆی پێچاوەو هیچ شوێنێکی دیار نیە لەبەر دەرگاکە وەستاوە، کاتێ بینیم زۆر ترسـام ووتم: ئـەی ئافرەت... چیت دەوێت بەم شەوە درەنگە؟

ووتی: تۆ باوکی قودامەی ؟ ووتم: بەڵێ...

ووتی: تۆ بووی ئەمرۆ ماڵت کۆکردەوە بۆ پارێزگاری سنور؟

ووتم: بەڵێ...کە ئەمەی لێم بیـست پارچـە کاغـەزێك و جـۆرگێکی بەسـتراوی پێـدام و بەگریانەوە ڕۆیشت، کاتێ سەیری کاغەزەکەم کرد لێی نوسـرابوو: ئـەی بـاوکی قودامـە تـۆ بانگی ئێمەت کرد بۆ غەزا و تێکۆشان لە پێناوی خودای گەورە..من ئافرەتێکم ناتوانم بێمـە غەزاو بجەنگم لەگەڵتان..هیچ ماڵێشم نەبوو یارمەتی جەنگاوەرانی پێ بدەم، بۆیـە چـاکترین

وجوانترین بەشی لاشەی خۆم بڕی کەهەردوو کەزیەکانم بوو، دوایـیش هۆنیمەوەو کردم بە پەتێك تا بیکەی بەڕێشمەی وولاخی جەنگەکانتان، بەو ئومێدەی خودای گەورە مـوو کەزیەکانم ببینێت کەبەشداری جەنگیان کردووە بەهۆیەوە لێم خۆشبێت و بەهەشتم پێ ببەخشێت.

کەئەوەم بینی زۆر سەرم سوڕما لەو پەرۆشی و قوربانی دانەی ئەم ئافرەتە لەپێناوی خودای گەورەو، ئەو پەرۆشی و ئارەزووەی بۆ لێخۆشبوون و بەهەشتی خودای تاك و تەنیا، هەر چەندە کارەکەشی دروستیش نیە، منیش جۆرکەکەی ئەوم هاوێشتە ناو کەل و پەلەکانی خۆم، کاتێ بەیانی داهات و نوێژی بەیانیم ئەنجامدا خۆم هاوڕێیەکانم بەرێ کەوتین بەرەو (ریققە)، کاتێ گەیشتینە قەلای (مەسلەمەی کوڕی عەبدولمەلیك) سوارێك بەدوامانەوە بوو بانگی دەکرد: ئەی باوکی قودامە ئەی باوکی قودامە... ڕەحمەتی خودات لێ بێت بوەستە...بە هاوڕێیەکانم ووت ئێوە: پێشکەون من دەچم بۆ لای ئەو سوارە بزانم چی دەوێت..کاتێ چوومە لای .. دەستی بە قسەکردن لەگەلم و ووتی سوپاس بۆ خودای گەورە کە لە هاوڕێیەتی تۆ بێ بەشی نەکردم و بە بێ ئومێدی نەگەڕامەوە .. ووتم: تۆ چیت دەوێت؟ ووتی: مەبەستمە لەگەلّ بێم بۆ جەنگ. منیش پێیم ووت: ڕووی خۆتم بۆ هەلّمالّە تا سەیرت بکەم ئەگەر گەورە بیت ئەوە غەزات لەسەر واجبەو دەتبەین،بەلام ئەگەر بچوك بی غەزات لەسەر نیەو دەتگێڕمەوە، پەردەکەی لەسەر ڕووی هەلّداوە، ڕوویەکی هەبوو هەر وەك مانگ دەدرەشایەوە، گەنجێك بوو لە تەمەنی حەڤدە سالاندا بوو، لێیم پرسی: ڕۆلّەگیان باوکت ماوە؟ ووتی: باوکم خاچ پەرستەکان کوشتوویەتیان منیش بۆیە هاتووم تا تۆلّەی باوکم بکەمەوە. دوایی پرسیارم لێی کرد: دایکت ماوە؟ ووتی: بەلّێ . ووتم: بگەڕێوە لای دایکت خزمەتی ئەو بکە بۆ تۆ باشترە چونکە بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە، کە ئەم قسەیەم پێی ووت بەسەرسوڕمانەوە ووتی: (سبحان الله) بۆ تۆ دایکی من ناناسیت؟! ووتم: نا سوێند بەخودا نای ناسم ووتی: دایکی من ئەو ئافرەتەیە کە سپاردەکەی لای تۆ داناوە. ووتی: کام سپاردە؟ ووتی: خاوەنی ڕێشمەکە ووتم: کام ڕێشمە ووتی: (سبحان الله) چەند زوو لەبیرت کرد! ئەو

ئافرەتەی دوێنێ شەو هاتە لات و جۆرکێك و رێشمەیەکی پێتدا ئەوە دایکی منـە، داوای لێ کردم کە لەگەڵ تۆدا بێم بۆ جیهادو سوێند داوم کـە بـە زینـدوویی بـۆی نەگەرێمـەوەو پێـی ووتومە: رۆڵەگیان ئەگەر رووبەرووی بێباوەڕان بوویتەوە نەکەی پشتیان تـێ بکـەیت.. خـۆت بفرۆشە بەخودای گەورەو..هەوڵبدە نزیك ببیتەوە لەخودای گەورەو میهرەبان.. لەگەڵ بـاوك و خاڵەکانت لەبەهەشتدا یەك بگرنەوە..وە ئەگەر پلەی شەهیدیشت وەرگرت لای خودای گـەورە تکام بۆ بکە.. ئینجا منی بە سینگی خۆیەوە کوشی و چاوەکانی بەرزکردەوە بەرەو ئاسمـان و ووتی: ئەی گەورەو پەروەردگارم ئەوە رۆڵەو بۆنی خۆشی دڵ و دەروون و پارچە جگەرمـە..بـە تۆی دەبەخشم و دەسپێرم بیگەینە بە باوك و خاڵەکانی.. دەفەرمووێ: بەڕاسـتی سـەیرم بـەو گەنجە دەهات..پاشان ئەو گەنجە زۆر بەپەرۆشەوە پێـی ووتم: توخـودا مامـە گیـان داوات لێ دەکەم ئەی باوکی قودامە بێ بەشم مەکەو مەمنێرەوە بۆ ماڵ با لەو غەزایە بەشداری بکەم. من ئینشاالله دەبمە شەهیدی کوڕی شەهید.. وە من هەموو قورئانم لەبەرە.. زۆر شارەزام لـە سوارچاکی و تیر هاوێژی.. بە کەمم سەیر مەکە بە هۆی بچوکیەکەم..کە ئەمەم لێـی بیـست نـەمتوانی بیگێڕمـەوە..لەگـەڵ خۆمـان بردمـان..سـوێند نـەم بینـی کـەس لـەو چـالاکتر بێت..لەڕۆیشتن لە هەموومان خێراتربوو..لـەکاتی نیـشتەجێبوون لەهـەموومان چـالاکتربوو، لەهەر بارێکدابایین لەپێش هەموومان بووو، بە زمـانیش بـەردەوام زیکـری خـودای گـەورەی دەکرد، کـە گەیـشتینە شـوێنی مەبەسـت سـنوورەکە کـاتی رۆژئـاوابوو، هـەر هـەموومان بەرۆژووبووین بۆیە دەستمان کرد بە ئامادە کردنی خواردن بۆ ئێـوارە و بـەیانی، ئـەو گەنجـە سوێندی خوارد کە نابێت کەس خوادنەکە ئامادە بکات جگە لەو، زۆر هەوڵمان لەگەلیدا کـە کەسانێکی تر بێت بەڵام ئەو رازی نەبوو، دوور کەوتەوە لەشـوێنێکی وا دووکـەڵ و ئاگرەکـە ئازاری خەڵکەکە نەدات دەستی بەئامادە کردنی خواردنەکە کرد، دوای ماوەیـەك چـاوەڕوانی خواردنەکە دواکەت، کاتێ بەشوێنیدا چووم بینـیم خواردنەکـە ئـاگری لـەژێرە و ووردە ووردە دەکوڵی، ئەو گەنجە ماندوو نەناسەش سـەری بەبـەردێك کـردووەو ڕاکـشاوە، خـەو زۆری بـۆ هێناوەو خۆی پێ نەگیراوەو نوستووە، پێم خۆش نەبوو بەئاگای بهێـنم خـۆم دەسـتم کـرد بـە

ئامادە کردنی خواردنەکە، کاتێ خەریکی ئاگر خۆش کردن بووم سەیری ئەم گەنجەشم دەکرد، چونکە هەموو هەڵسوکەوتوکانی جێی سەرنج و تێڕامان بوو، لە کاتێ یەکێ لە دیقەتدان سەرنجدانەکانم بینیم پێ دەکەنێت..پێکەنینەی زیاتربوو..زۆر سەیرم بەو پێکەنینەی هات..بەردەوام پێکەنی..پێکەنینەکەی زیاتربوو، دوایی لەگەڵ پێکەنینەکەی بەئاگا هات، کە ئەوەم لێی بینی زۆر سەیرم پێ هات..کە بەئاگا هات و منی بینی شەرمەزاربوو، ووتی: مامە گیان خواردنەکەم لێ دواخستن، ووتم: نەخێر دوات نەخستی یە، ووتم: من خواردنەکە ئامادەکە دەکەم، ووتی: نەخێر نابێت هەر دەبێت خۆم ئامادەی بکەم، من خزمەتکاری تێکۆشەرانی ڕێگای خودام، ووتم: سوێند بەخودا لێناگەڕێم ئەو کارە بکەیت ، تا باسی ئەو پێکەنینەی خۆتم بۆ نەکەیت لەخەوەکەتدا، ئەو پێکەنینانە چ بوو لە خەوەکەتدا؟! پێکەنینێکی زۆر سەیربوو!! ووتی: مامە گیان خەوێك بینیم. ووتم: سوێند بەخودا دەبێت باسی ئەو خەوەم بۆ بکەیت و بزانم چ خەوێك بووە! ووتی: وازبێنە با لەنێوان خۆم و خودا دابێت، ووتم: سوێند بەخودا هەر دەبێت بۆم باس بکەیت، ووتی: لەو خەوەدا منیان بردە بەهەشت، بەهەشتم بینی بەو هەموو جوانی و ڕازاوەییەی خۆی وەك باسکراوە لە قورئانی پیرۆز، کاتێ تێیدا دەسوڕامەوە بەسەرسامیەوە لەو هەموو جوانی و ڕازاوەییەی، باڵاخانەیەکم بینی دەدرەشێتەوە، دروستکرابوو لە خشتێکی زێڕو خشتێکی زیو، بەگەوهەر دوڕو یاقوت هەڵنرابوو، دەرگاکانی لە زێربوو، پەردەیەکیان بەسەریدا هێنابووە خوار، چەند کچوڵەیەك پەردەکەیان لادا، ڕوویان وەك مانگ دەدرەوشایەوە، کەئەو جوانیەی ئەوانم بینی ویستم سەیریان بکەم، سەرسام ببووم بە جوانیەکەیان، کاتێ یەکێکیان کە جوانترینیان بوو، قسەی لەگەڵ ئەوەی دەستە ڕاستی دەکردو، ئاماژەی بۆ من کردو ووتی: ئەمە پیاوی (مرضیە)یە، ئەمە پیاوی (مرضیە)یە، پرسیارم لێی کرد: تۆ (مرضیە)ی؟ ووتی: من خزمەتکارێکم لە خزمەتکارەکانی(مرضیە)، دەتەوێ (مرضیە) ببینی؟ وەرە بۆ ناو ئەو باڵاخانەیە، ڕەحمەتی خودات لێ بێت پیش کەوە، پێشی کەوتم لەسەرەوەی باڵاخانەکە ژوورێکی دروستکراو لە زێری سوورم بینی تەختێکی دروستکراو لە (زوبرجودی) سەوزی تێدابوو، پێچکەکانی لەزیوی

سپی دروستکرابوو، کچۆلەیەکی لەسەر دانیشتبوو ڕووی وەك خۆر دەدرەوشایەوە، ئەگەر خودای گەورە چاوەکانی نەپاراستبام هەردوو چاوەکانم لەدەست دەداو هۆش و عەقلیشم لەسەر نەدەما، کاتێ ئەو کچۆلّە منی بینی دەستی بەقسە کردن کرد لەگەلّم و ووتی: یا خوا بەخێر بێی ئەی خۆشەویست ودۆستی خودای گەورە، من بۆ تۆم و تۆش بۆ منی، کاتێ بینیم و کوێم لە قسەکانی بوو لێی نزیك بوومەوە، ویستم دەستی لەسەر سەری دانێم ووتی: ئەی خۆشەویست و دۆستی من خودای گەورە بتپارێزی لە داوێن پیسی، کەمێکت ماوە لە دونیاو، بەیانی دوای نوێژی نیوەڕۆ کاتی بەیەك گەیشتنمانە، بۆیە پێکەنیم و دلّخۆش بووم.

ئەبو قودامە دەفەرمووێ: دوای ئەوەی نانی بەیانیمان خوارد،ئینجا بەڕێ کەوتین چوینە لای برا ئیشکگرەکانمان و، نوێژی بەیانیمان کرد، دوژمنیش بەرامبەرمان وەستا بوون، بۆیە ڕیزەکانی خۆمان توندو تۆلّ کردو، سەرەتای سورەتی(ئەنفال)م بۆ خوێندنەوە، باسی پاداشتی تێکۆشان لەپێناو خودای گەورەو پلەوپایەی شەهیدیم بۆ کردن، کاتێ سەرنجمدا هەر کەسە لەگەلّ خزم ودۆستی خۆی کۆ ببۆوەو دانیشتبوو، تەنها ئەو گەنجە نەبێت بێ کەس بێ باوك و براو خزم و کەس دانیشتبوو، کاتێ بەڕێ کەوتین بۆ غەزاو تێکۆشانەکە لەپێشەوەی هەموو سوپاکە بوو، چومە لای و پێم ووت: ڕۆلّەگیان هیچ شارەزاییت هەیە لە شەڕو جەنگ؟ ووتی: نەخێر..سوێند بە خودا ئەمە یەکەم جەنگ و یەکەم شەڕە بەشداری تێدا دەکەم، ووتم: ڕۆلّە ئەوەی تۆ بیری لێدەکەیتەوە بەم شێوە نیە، ئەمە شەڕە خوێن و دەنگی ئەسپ و وولّاغ و بەرەو پێش چوون و گەڕانەوەو تیربارانی تێدایە، بۆیە تۆ بڕۆ دواوە، ئەگەر سەرکەوتین ئەوە لەگەلّ ئێمە بەشداری، ئەگەر ژێر کەوتین و شکستمان خوارد تۆ لەیەکەمی کوژراوان نابیت، زۆر بە سەرسوڕمانەوە سەیری کردم و ووتی: تۆ وا بە من دەلّێیت. ووتم: بەلّێ. ووتم: ئەی مامە گیان دەتەوێت ببم بەخەلّکی دۆزەخ، ووتم: نەخێر نامەوێت ـ پەنابەخوداـ، (واللە) نەهاتوین بۆ تێکۆشان و غەزا تەنها لەترسی ئاگرو دۆزەخ و، بۆ بەدەست هێنانی بەهەشت نەبێت، ووتی: خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ

بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾ {سورەتی الأنفال: ئایەتی١٥ـ١٦} واتـە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێك بەرەنگاری ئەوانە بوونەوە کـە بـێ بـاوەڕبوون لـەکاتی لەشکرکێشیدا ئەوە پشتیان تێ مەکەن و ڕامەکەن * هەر کەس لـەو ڕۆژەدا ڕابکاتـە دواوەو پشتیان تێ بکات ئەوە بەڕاستی لەگەڵ خەشم و قینی خـوادا گەڕاوەتـەوەو سـەرەنجام جـێ و ڕێگەی دۆزەخە کە ناخۆشترین جێگەو سەرەنجامە مەگەر مەبەستی بـەکار هێنـانی هونـەری جەنگ بێت یاخود مەبەستی شوێن گۆڕین و جێ گۆڕکێ بێت بۆ لای دەستەیەکی تر)

ئایا تۆ دەتەوێت: بیری دواکەوتن بە بیرم دابێت و بە هۆیەوە توشی ئاگرم؟

بەڕاستی سەرسام ببووم لەو پەرۆشی تێگەیشتنی لـەو ئایەتـە پـیرۆزە، پێـیم ووت: ئـەم ئایەتە پیرۆزە ئەم مەبەست ومانایە ناگەیەنێت، بەڵام ئەو هەر سوور بوو لەسەر ڕای خۆی، بە زۆری ڕام کێشا تا بۆ دواوەی بەرم بەتوندی خۆی ڕاپسکاندو بـۆ پێـشەوە چـۆوە، لەگەرمـەی شەڕەکەدا بووین، لێك بزر بـووین.. شمـشێرەکان لەکالانـەکان هاتنـە دەر، تیربـاران دەسـتی پێکرد..سەرو کەللەکان دەشکان و دەپـڕژان.. دەسـت و قاچـەکان دەپـەڕین ..کـەس ئاگـای لەکەس نەبوو ، شمشێرەکان گەرم داهاتبوون و سوور ببونەوەو بلێسەی ئاگریان لێ هەڵدەسـتا، تا نیوەڕۆ بەم شێوە جەنگەکە بەردەوامبوو، لەگەڵ سـەرەتای نوێـژی نیـوەڕۆ خـودای گـەورە سەرکەوتنی خۆی ناردو سەری خستین بەسەر خاچ پەرستـەکان، نوێـژی نیوەڕۆمـان ئەنجامـدا بەئەوپەڕی دڵخۆشی کامەرانیەوە بەڕەحمەت و سەرکەوتنی خودای گەورە.

باوکی قودامەی سەرکردە دەفەرمووێت: دوای نوێژ هەر کەسـەو بـەدوای خـزم و دۆسـتی خۆیدا دەگەڕا، منیش ئەو گەنجەم بیر هاتەوە، ـ کەکەسی نەبوو لێی بپرسی ـ، کاتێ گەڕاینو سوڕاین لە ناو کوژراوان بینیم کەسێك بـەدەنگێکی نـزم و لاوازەوە دەڵێـت: ئـەی خەڵکینـە مامەم باوکی قودامەم بـۆ بنێـرن، کـاتێ ئـاوڕم داوە بـەرەو لای دەنگەکـە، بینـیم لاشـەی گەنجەکەیە کەوتووە، چەند تیرو ڕمێکی بەرکەوتبوو، زۆر بە خێرایی بۆ لای چووم، لەبەردەمی دانیشتم و ووتم: ئەوەتە من باوکی قودامەم، ووتی: سوپاس بۆ خودا منی هێـشتەوە تـا ئـەو ڕاسپاردەت پێ بسپێرم، پاشان بەدەنگێکی نزم ووتی: ئەی مامە گیان ئەگـەر گەڕایتـەوە بـۆ

(ریققه)، موژگێنی بده به دایکم و پێی بڵێ: خودای گەورە دیاریەکەی لێ وەرگرت و، کوڕەکەی کوژرا له جەنگ لەبەرەو پێش چوون و نەوەك بەرەو پاش چوون، ئەگەر خودای گەورەش پلەی شەهیدی لێ وەرگرتبم ئەوە سەلامی ئەو بەباوك و خاڵەکانم دەگەینم، بەڵام مامه گیان نەوەك دایکم بڕوا نەکات هەندێ له جل و بەرگە خوێناویەکەم لەگەڵ خۆت بۆی ببەرەوە تا دڵنیابێت، وە پێی بڵێ: ئینشاالله لەبەهەشت بەیەك دەگەینەوە. پاشان بەهەناسەیەکی توندو تەنگ دەنگێکی نرم و لاوازەوە ووتی: مامەگیان سوێند بە خودای کەعبە خەوەکەم هاتەدی و ڕاست دەرچوو، ئەوە (مرضیه) وا لەسەرسەرمە بۆنی دەکەم، ئینجا هەناسەی تەنگ بوو نێو چاوانی ئارەقەیەکی کردو، چەند هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی و داوەو گیانی سپارد.

دەفەرمووێ: منیش جلەکانیم خستە ناو جۆرکێك و لەگەڵ خۆم بردمەوە بۆ (ریققه) بۆ دایکی، کاتێ گەیشتمەوە نەم دەزانی دایکی ناوی چی یە، ماڵیان لەکوێ یە، بۆیە گەڕام لەناو کوچەو کۆڵانەکانی ئەوشارە، بەبەر دەرگای ماڵێکدا تێدەپەڕیم، کچێکی تەمەن نۆساڵان لەبەر دەرگا وەستابوو، کاتێ منی بینی شێوەی ڕێبواریم پێوە دیاربوو جۆرکێکیشم بە دەستەوەبوو ووتی: مامه گیان له کوێوە دێیت؟ ووتم: له غەزا دێمەوە. ووتی: براکەی منتان لەگەڵدا نەبوو؟ ووتم: ئەی کوا دایکت؟ ووتی: لە ژوورەوەیە. ووتم: پێی بڵێ با بێتە دەرەوە..کە هاتە دەرەوە پیرەژنێکی بەتەمەن بەجارۆگەکەی خۆی داپۆشیبوو، کە دەنگمی بیست ووتی: باوکی قودامە.. بۆ دڵنەواییم هاتووی، یاهاتووی موژگێنیم پێ بدەی؟! ووتم: ڕەحمەتی خودای گەورەت لێ بێ مەبەستت چی یە؟ له دڵنەوایی و موژگێنی دان بۆم ڕوون بکەوە؟ ووتی: ئەگەر هاتبیت بۆ ئەوەی هەواڵی کوژرانی کوڕەکەم پێ بدەیت لە پێناوی خودای گەورەو ڕووەو پێش و بەرەو دواوە نەگەڕابێتەوە ئەوە موژگێنیەو، خودای گەورە ئەو خەڵاتەی لێ وەرگرتووم کە ماوەی حەڤدە ساڵە ئامادەم کردووە بۆی، بەڵام ئەگەر هەواڵم پێ بدەیت بە زیندوویی کوڕەکەم ئەمە تازیەداریە بۆ من.

منیش ووتم: کەوابوو ئەوە من هاتووم موژگێنییت پـێ بـدەم، کـە کورەکـەت کـوژراوەو، ئەمەش جل وبەرگە خوێناویەکەتی، کاتێ جلە خوێناویەکەی بینی لەخۆشیا ووتی: (الله أکبر) زۆر دڵخۆش و کامەران بوو، چۆوە ژوورەوەو دەرگاکەی داخست، لە پشت دەرگاوە کوێم لێـی بوو دەی ووت: ئەی خـودای گـەورەو میهرەبـان پیـاوو براکـانم و جگـەر گۆشـەکەم بەخـشی لەپێناوی تۆ، خودایە تەنها بۆ ئەمە بووە تا تۆ لێم رازی بیـت، ئـەی خودایـە لەگـەڵ ئـەوان لەبەهەشتدا کۆم بکەوەو بەئەوانم بگەینە.

چەند جارێك لەدەرگاکەمدا تا برێك پارەو پوولیان پێ بدەم باسی پلەو پایەی بکەم لـەناو خەڵکی شارەکەدا، بەڵام نە دەرگاکەی کردەوەو نە وەڵامی دامەوە.

## منیش وەك دڵسۆزێك دەڵێم بە گە نجەکانی ئێستا:

١ـ ئەمەی باسمان کرد بەسەرهاتی گەنجێکە بەڵام نەوەك گەنجانی تـر، گـەنجێك بـە لـەش لەسەر زەوی ،بەڵام بە روح و بـەگیان وەك فریـشتە بێگـەردو پاکـەکانی خـودای گـەورە لـە بەرزیەکان دەژیا.

٢ـ ئەو جوانی و رازاوەیی ئافرەتانی ئەم سـەردەمەی ئێـستا بـەراورد بکـە لەگـەڵ ئـەو حۆریانەی بەهەشتی هەتا هەتایی ئینجا بریار بدە یەکێکیان لەم دوانە هەڵبژێرە.

٣ـ دایکانی بەرێز: ئەمەش دایکێك بوو بەڵام نەوەك دایکـانی ئێـستا دایکێـك هـەموو سۆزو خۆشەویستی وئاواتی گەیشتن بوو بە بەهەشت.

٤ـ پرسیار لە خۆت بکە:پاڵەوانانی ئەم چیرۆکە لە کوێن؟ چیان زەرەر کرد؟

وەك ئێمە مرۆڤ بوون، حەزو ئارەزوویان هەبوو، ژیان و مردن، بەڵام چۆن مردنێك!

بەرنامەی رۆژووەوان: نوێژی خەوتنان(عیشا):

١ـ (٣٠) سی خولەك نیو کاتژمێر بەر لەبانگ خۆت ئامادە بکە.

٢ـ هەوڵبدە هەر رۆژێکی کانگی رەمەزان لەمزگەوتێك نوێژی (عیشا)و تەراویح بکەیت.

٣ـ (١٠) دە خولەك بەر لەبانگدان ئامادە لەمزگەوت.

٤ـ دوو رکات سوونەتی چوونە ناومزگەوت بکە.

٥ـ وەڵامی بانگ بدەرەوەو دوعای وەسیلە بخوێنە.

٦ـ نوێژی تەراویح بەتەواوی بکە.

بریاری گۆڕانکاری بدە: بزانە ڕەمەزانی ڕابردوو چەند ڕۆژ نوێژی تەراویحت کرد، با ئەمساڵ لەئەنجامدانی نوێژی تەراویحەکانت گەرم و گوڕترو باشتربیت، پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) دەفەرمووێ: ((من قام رمضان إيمانا وإحتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه)) {بوخاری گێڕاویەتیەوە} واتە: (ئەوەی شەوو نوێژ بکات لەمانگی ڕەمەزاندا بەبڕواو مەبەستی پاداشتی ڕۆژی دوایی خودای گەورە لەهەموو گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت)

شاعیری خواناس دەڵێت:

ئەگەر ببی بە پۆڵا

دونیا بدەی بە کۆڵا

دەبێ برزی لە خۆڵا

# خەلاَتی شازدەهەمین

## ئاگاداری میوانی لە ناکاو بە

براو خوشکانی بەڕێز: ڕۆژووەوانی مانگی ڕەمەزان مردن میوانێکی لەناکاوو بەزەحمەتە بۆ هەموو کەسێك، بەتایبەت کەسانی دوور لەخودای گەورە، بێ ئاگاو مەست بەو ژیانە کورت و کەمەی دونیا، وا خۆیان حالّی کردووە کە ئەو دونیایە هەتا هەتاییەو کۆتایی نایەت، یا کە مرد کۆتایی بە هەموو شتێك دێت نازانێت ژیانی بەردەوام و نەبڕاوە دوای مردن دەست پێدەکات، نموونەی ئەو جۆرە کەسەش لەم چیرۆکە ببینە:

لە یەکێ لە وولاّتە عەرەبیەکانی دەوروبەرمان، ئافرەتێکی دینداری خوناس شارەزا لە دینی خودای گەورەو خەمخۆر بۆ دینی خوداو بەندەکانی خودای کار بەجێ، ئەو بەشەرم و شکۆیە دەلّێت، ڕۆژێکیان لەگەلّ دایکم بەیەکەوە چوینە سەردانی پزیشکێکی تایبەت بەنەخۆشیەکانی ئافرەتان، کە چوین نۆرەمان مابوو بچینە ژوورەوە بۆیە لەهۆلّی چاوەڕوانی دانیشتین تا نۆرەمان دێت، کاتێ بینیمان ئافرەتێك هاتە ژوورەوە بەلاّم چ ئافرەتێك زۆر بێ شەرم ولەخۆبایی جلێکی لەبەردابوو ئێمەی ئافرەتان شەرم لە خۆ کردەوە تابلّێی تەنگ و تەنك و هەرچی شوێنی عەیبداری هەبوو بەدەرەوەبوو، پرچەڕەنگاو ڕەنگەکەی بەهەموو شانەکانیدا هێنابووە خوارەوەو پەرش و بلاّو کردبۆوە، بێ ئەوەی سەلام لە کەس بکات چووە لای سکرتێرەکە ژمارەکەی وەرگرت و هات دانیشت پێی لەسەر پێی دانا بێ دانا بێ ڕێزیـ ئەو کەسانە دابنێت کە بە تەمەن و ڕێزدارن مۆبایلەکەی دەرهێنا خۆی خەریکی مۆبایلەکەی کرد، منیش هەموو بیرو ئەندێ ئەندێشەم لای هەلّسوکەوت وشێوەو شێوازی ئەو ئافرەتە داماوە بوو بۆیە زۆر دلّم پێێ سووتاو بۆی پەرێشان بووم کەوتمە بیر کردنەوە لەدلّ و دەروونی خۆم چۆن وەك ئەرکەکی سەرشانم ئەوەی دەیزانم پێی ڕابگەینم، کاتێ بیرم لەخۆباییبوون و بێ ڕێزیەکەی دەکردەوە بێ هیوایی و بێ ئومێدی ڕووی تێدەکردم، کە بیرم لەو ئەرکە گەورەی سەرشانم دەکردەوە کەگەیاندنی ئەو زانست و شارەزاییەیە کەخودای گەورە پێی داوم و

پێویستە لەسەرم ڕای بگەینم گورو تینم زیاتر دەبوو، دوای گفتۆگۆیەکی دەروونی بریارمدا قسەو گفتوگۆی لەگەڵدا بکەم، بەترسەوە چوومە لای و لەتەکی دانیشتم و ووتم: دەکرێ پرسیارەك بکەم؟ زۆر بە لووت بەرزیەوە ووتی: فەرموو بلّی. ووتم: تۆ موسلّمانی؟ ووتی: ئینجا ئەوە کێشەی تۆیە. ووتم: دەزانی ئەو جل و بەرگەی تۆ ناشەرعیەو خودای گەورە پێی رازی نیە؟ زۆر بە تورەییەوە ووتی: ئەوە ئیش و کاری تۆ نیەو، خۆت تێکەڵی بابەتێك مەکە کەپەیوەندی بەخۆمەوە هەیە. زانیم ئەم قسانە هیچ سوودی نیە بۆی، بۆیە ووتم بامردن ودوارۆژ بی ترسێنم ووتم: ئەگەر ئێستا (ملك الموت) فریشتەی روح کێشان بێتە لات و گیانت بکێشێت چی دەکەی؟ چۆن دەگەڕێیتەوە بۆ لای خودای گەورە بەم جل و بەرگە؟ بەلاّم ئەوەی چاوەڕوانم نەدەکرد ووتی: دەزانی چی پیّ دەلّێم: دەلّێم (کش مەلەك) (کش مەلەك) واتەی کشەی لیّ دەکەم. کە ئەم وەلاّمەم لێی بیست موچڕك بەهەموو لاشەم داهات، هەموو گیانم لەرزی و چوومەوە شوێنی خۆم دانیشتمەوەو دوای ماوەیەك نۆرەکەمان هات و چوینە لای پزیشك و دوای تەواوبوونەپشکنینەکەمان هاتینە دەرەوە بینیمان ئەو خەلّکەی لەهۆلّی چاوەڕوانیەکەدا بوون هەموو شلّەژابوون و کۆببوونەوە لەسەر کەسێك زۆر بەپەرۆشیەوە یەکیّ دەی ووت ئاوبێنن ، یەکیّ دەی ووت بانگی پزیشك بکەن، لەگەلّ ئەم دەنگە دەنگ و هات و هاوارە پزیشکەکە هاتە دەرو ووتی: ئەمە چی بووە؟ ووتیان: ئەم ئافرەتە لەهۆش خۆی چووە. پزیشکەکە هاتە سەری دوای پشکنینێکی سەرەتای ووتی: بەداخەوە گیانی سپاردووەو وەفاتی کردووە، کاتیّ سەیرم کردو لێی ووربوومەوە بینیم هەمان ئەو ئافرەتە بوو کەپێش کەمێك بە منی ووت ئەگەر فریشتەی روح کێشان بێت گیانم بکێشێت کشەی لیّ دەکەم و لە خۆمی دوور دەخەمەوە.

بەلّیّ خۆشەویستان: زۆر جار خودای گەورە لووتی لووت بەرزانی شکاندووەو دەمادەم یەکسەرو بەبیّ مۆلّەتدان شتی وای بەسەر هێناون و نیشان داون کەمایەی پەندو ئامۆژگاری لیّ ووردبوونەوەیە.

## ڕوو دەکەمە خوشکانی بەڕێزو سەنگین:

١ـ خوشکی خۆم زانست و زانیاری و شارەزابوون لە ئایین و قورئـان ئەرکـە لەسـەرت و، ئایا ئەو بڕوانامەی بە دەستت هێناوە تا چەند بەکارت هێناوە بۆ خزمەتی ئایینەکەت، توخوا بڕوانامەو زانستەکەت ئەگەر نەی کەیت بەهۆکارێك بۆ خۆ شارەزا کردن لە ئایین و قورئـان چ سوودێکی هەیەو، لە ڕۆژی دوایی چۆن وەڵامی خودای گـەورە دەدەیتـەوە، کـاتێ تـا ئێـستا قورئانت خەتم نەکردبێت، هیچ شارەزایی و زانیاریەکت نەبێت لە ئایین .

٢ـ گەیاندنی ئەوەی دەزانیت ئەرکی سەرشانتە بەرامبەر هەموو کەسێك، بانگەوازی بـۆ ئایین و هاوکاری کردنی خەڵکی نەزان واجبە، ئەوەی پێویستە لەسەر تۆ گەیاندنی ئەوەیە کـە دەیزانی وشارەزاییت لێی هەیە.

٣ـ گرنگترین شت بۆ بانگخواز هێنانە جێی گوفتارەکانیەتی بۆ گۆڕپانی کرداروکـردەوە، لەهەموو شتێکیش پێویستر بۆ خوشکی بانگخواز شێوەو شێوازی جـل و بـەرگ و پۆشـاك و ڕوخساریەتی، ئەگینا ئایینێکی ناتەواوو خوارو نادروست دەگەیەنێت، ئـەو کاتـەش گونـاهی زیاتر دەبێت لە خێرو پاداشتی.

٤ـ خوشك و برای خۆشەویست مردن گەورەترین ڕاستیە گومانمان لە مردن نیە، مردنێـك هەیە، کە ئەو مردنە دەرگاو دەوازەی هەموو ناخۆشیەکانە بزانە: جێگات ناو گۆڕێکی تەنگ وتاریکە، بـەرگ و پۆشـاکەکەت پارچـە کفنێکـی بـێ ڕەنـگ و مۆدێلاتـە، ئەوپرسـیارانەی ئاڕاستەت دەکرێت: خودات کێ یە؟ پێغەمبەرەکەت کی یە؟ ئایینەکەت چ بووە؟

* خوشکی گەورەم: بیر بکەوە لەو ژیانەی ڕابوردووت و پرسیار لە خۆت بکە:

ئایا چەند شارەزاییت هەیە لە دینی خودای گەورە، چەند کتێبـت خوێندۆتـەوە لـەبواری بیروباوەڕو، خودای گەورەو میهرەبان، چەند شارەزای لە ژیاننامەی خۆشەویـستی ڕاسـتەقینە کەپێغەمبەرو(ﷺ) تاجی سەرە.

ئایا تا ئێستا چەند کەست ئامۆژگاری کردووە؟

ئایا دەزانی پۆشاکەکەت بەر ئەوەی لای بەرگدروو دیزاینی و نەخشەی بۆ بکێشن خودای تەعالا لەقورئانیپیرۆز بریاری لەسەر داوەو باسی لێوە کردووە:﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ {سورەتی النور: ئایەتی٣١} واتە:(بە ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ: چاویان بپارێزن لەتەماشای نامەحرەم داوێنی خۆیان بپارێزن لەگوناهو جوانی خۆیان دەرنەخەن، جگە لەوەی کەدیارە (وەك دەم وچاوو دەست) با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەو ملیانداو جوانی وزینەتی خۆیان دەرنەخەن بەتەواوی بۆ هاوسەرەکانیان نەبێت، یان باوکی خۆیان، یان باوکی مێردەکانیان، یان کوڕی خۆیان، یان کوڕی مێردەکانیان، یان بۆ براکانی خۆیان، یان برازاکانیان، یان خوشکەزاکانیان، یان ئافرەتێك کەپەیوەندیان هەیە پێکەوە، یان ئەوانەش کە کەنیزەکیانن(کە لە بارودۆخی تایبەتدا هەبوون) یان ئەوانەی کە لەماڵەکانتان دەژین و پێویستیان بەئافرەت نیە (لەبەر پیری، یان نەخۆشی...هتد) یاخود ئەو منداڵانەی کە هێشتا شارەزاییان لەئافرەتان نیەو(ئارەزووی جنسیان بۆ دروست نەبوەو نازانن باسی عەورات بکەن) نابێت ئافرەتانی ئیماندار قاچیان دەربخەن و پێیان بدەن بەزەویدا( تا دەنگی خشڵ و پاوانەکانیان بێت) و بزانرێت کە زینەتدارو خشڵدارن، کەواتە هەمووتان ئەی ئیمانداران بەرەو لای خواو بەدەستهێنانی رەزامەندی ئەو بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی رزگارو سەرفرازبن).

﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ {سورەتی الأحزاب: ئایەتی٥٩} واتـە: (ئـەی پێغەمبەر(ﷺ) بەهاوسەرانت وکچەکانت و ئافرەتانی ئیماندار بلێ: کە بە پۆشـاکی باڵـاپۆش خۆیان داپۆشن ئەوە لەبارترین شتە کە پێی بناسرێن، تائازار نەدرێن و(تووشـی گـیرو گرفـت نەبن)، هەمیشە و بەردەوام خوالێخۆشبوو میهرەبانـە(لـە کـەم وکـوڕی ڕابوردووتـان خـۆش دەبێت).

کەوابوو بیرێك لەو پۆشاك (حیجاب)انەی ئەو بکەوەو بەراوردی بکە لەگەڵ ئەو ئایەتانەی خودای گەورەو میهرەبان.

ئەی ئەو خوشکە بەڕێزانەی کە تەنها لە مانگی ڕەمەزانـدا سـەر دادەپۆشـن و پۆشـاکی باش و داپۆشەر دەپۆشن، دەسخۆشیتان لێ دەکەم چونکە بڕواتان بـەخودای ڕەمـەزان هەیـەو ڕێزی ئەو مانگە پیرۆزەتان لایە، ئەمەش بە ویست و ئیزنی خودای تاك و تەنیا ڕۆژێـك دێـت لەبەر خاترو ڕێزی خودای ڕەمەزان بەیەکجاری بڕیاری (حیجاب)ی شەرعی بدەن.

خوشکی گەورەم بزانە پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) نەفرەتی کردووە لە:

برۆ دەرهێنان و باریك کردنەوەی ئەوەی کارەکە دەکات ئەوەی بۆی دەکات

کوتان پێست ئەوەی کارەکە دەکات و ئەوەی بۆی دەکات

ئەو ئافرەتەی دەچێتە سەر گۆڕ

ئەو ئافرەتەی خۆی بە پیاو دەچوێنێت

ئەو ئافرەتەی سەر دولکە دەڵێت

بەرنامەت بۆ نوێژی ویتر:

١ـ لە(٣) سێ ڕکات تا(١١) یازدە ڕکات دەتوانیت بیکەی.

٢ـ ئەو (١١) یـازدە ڕکاتـە دەتوانیـت هەنـدێکی لەکزگـەوت بکـەیت و، هەندێکیـشی ماڵەوەبکەیت.

٣ـ ئەونوێژەی لەماڵەوە دەیکەیت تا دوای بخەیت باشترو خێر ترە.

٤ـ ئەگەر نوێژی تاکەکەت لەمزگەت کردبوو، شەو دەستت بە نوێژ کردن کردەوە، یەك تاکە رکات نوێژ بکە لەگەڵ ئەو تاکە نوێژەی ئێوارە کردوتە دەبێتەوە جووت، ئینجا چەندی مەبەستتە نوێژ بکەو دوایی تاکە رکاتێکی تر بکەوە.

بریاری گۆڕانکاری بدە: تائێستا چەند تام و چێژت لەنوێژەکانت کردووە، لەمەودوا بیربکەوە لەماناى ئەو (فاتیحە) بکەوە کەلەتەمەنی رابردووت تائێستا رۆژانە بەلای کەم(١٧) حەڤدە جار خوێندووتە، بیر لەماناى ((سبحان ربي العظيم)) و ((سبحان ربي الأعلى)) و ((سمع الله لمن حمده)) ووشەکانی ((تەحیات)) بکەوە.

# خەلاتی حەڤدەهەمین

## جەنگی بەدر لەمانگی جەنگی دەرووندا

جەنگی بەدری گەورە پڕیەتی لەپەندو وانەی بەسودو بەکەلك، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە لەمانگی پڕ لەخێرو بەرەکەتی ڕەمەزانداین بۆیە حەز دەکەم بۆ ئێوەی ڕۆژووەوان ئەو هەڵوێستەی پێغەمبەری سەروەرتان(ﷺ) بیر بخەمەوە سەبارەت بەمافی خەڵکان، بزانن ئەوە پێغەمبەری خودایە خوادی گەورە لەهەموو گوناهەکانی ساڵانی ڕابردوو داهاتووی خۆشبووە، ئینجا فەرموون ئێوەو سەردارو نازدارو بینایی چاومان(ﷺ) چۆن ملکەچ دەبێت وخۆی دەخاتە بەردەستی سەربازو هاوەڵێکی تا تۆڵەی لێ بسێنێتەوە:

ڕۆژی حەڤدەی ڕەمەزان بەیانی زوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) موسڵمانە جەنگاوەرەکانی کۆ کردەوەو ڕیزڕیزی کردن، بەناو ڕیزەکانیاندا دەگەڕاو دەسوڕا، یەك یەك پێیەکانیانی لەگەڵ براکانی تەنیشتیان جوت و ڕێك دەخست و، هەر هەموو وەك مسی داڕێژراو وەستاندبوونی، بۆ ئەو مەبەستەش تیرێکی بەدەستەوە گرتبوو، کاتێ بەلای (سەواد)ی کوڕی (غەزییە)دا تێپەری لەڕیزەکەی هاتووەدەرو سگی دەرپەڕاندبوو، بەتیرەکەی لە سگی داو فەرمووی: (ڕاستبە ئەی سەواد) سەواد ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئازارت پێ گەیاندم خودای گەورە تۆی بەحەق و دادپەروەری ناردووە تۆڵەی خۆم لەتۆ دەوێتەوە، هاوەڵ و یاران سەریان سوڕما لەو هەڵوێست و کارەی (سەواد) هەرچەندی هەوڵیان لەگەڵیدا بەڵام هەر سووربوو لەسەر تۆڵە وەرگرتنەوەی خۆی، لەدواییدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: فەرموو ئەی(سەواد) ئەوە تیرەکەو تۆڵەی خۆت بکەوە. ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ تۆ لەمنتدا سگم ڕووتبوو بۆیە دەمەوێت سگی خۆت بەدەر بخەی تا تۆڵەی خۆم بکەمەوە، یارانی پێغەمبەر زۆر زیاتر پەرێشان و دڵتەنگ بوون بەڵام پێغەمبەری خۆشەویست سگی خۆی بەدەرخست و فەرمووی: فەرموو ئەی (سەواد) تیری تۆو سگی من تۆڵەی خۆت بکەوە. لەناکاو لە پڕێکا(سواد)پەلاماری پێغەمبەری داو پڕ بەدڵ سگی پێغەمبەری ماچ کرد، پێغەمبەری

سەروەر(ﷺ) فەرمووی: (چ شتێك پاڵی نای وا بکەیت ئەی(سەواد)؟) ووتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەبینی ئێمە بەرەو کویّ و خەریکی چین، حەزم کرد کۆتایی ژیانم بەوە بێت کە پێستم بەر پێستت بکەوێت، ئینجا پێغەمبەری خۆشەویست نزاو پاڕانەوەی خێرو باشی بۆی کرد.

## بەڕێزەکانم خوشك و برایانی ڕۆژووەوان:

١ـ دەبینن مافی خەڵك چەند گرنگ و گەورەیە لەئایینی پیرۆزی ئیسلام.

٢ـ زۆر ئاگاداری قەرز بە مافی خەڵکەو، ماڵی کەس بۆ کەس حەڵاڵ و نیە.

٣ـ ئایا دەزانی پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) نوێژی مردووی لەسەر کەسانێك نەدەکرد لە هاوەڵانی ئەگەر قەرزار بان.

٤ـ بزانە شەهیدی ڕێگای خوداش ئەگەر مافی خەڵکی لەسەر بێت ناچێتە بەهەشت تامافەکەی لەسەر لا دەچێت.

* ئەگەر وورد ببینەوە لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزو جەنگی بەدری گەورە لەچەندین ڕووەوە هاوتەریب و هاوکارن لەگەڵ یەکتر:

* بەدر واتە ئەوکاتەی کە مانگ لەتەواو بووندایەو شەوەکانی مانگەشەوو ڕووناکە، مانگی ڕەمەزانی پیرۆزیش ڕووناك کەرەوەی دڵ و دەروون و مانگێکی پرشنگدارە لەناو کۆمەڵگەی موسڵمانان.

* لەو جەنگەدا بێ برواو دووڕووەکان بەتەواوی لەموسڵمانان جیابوونەوەو خودای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا ئەو جەنگەی بە(یوم الفرقان) ناوبردووە، بە دابەزینی قورئانی پیرۆزیش لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا حەق و ناحەق لەیەك جیا بۆوەو یەکێ لەناوە پیرۆزەکانی قورئانی پیرۆزیش (الفرقان)ە.

* لەومانگەدا موسڵمانان بەسەر نەفس و ئارەزووە شەیتانیەکانیاندا زاڵ دەبن، لەو جەنگەشدا موسڵمانان بۆ یەکەمجار بەسەر بەجکە شەیتانەکاندا زاڵبوون و تێکیانیان شکاند.

* لەو مانگەدا شەیتان كۆت و زنجیرو دەكرێت و بێ هێزو بێ دەسەلاَت دەبێت، لەجەنگی بەدری گەورەو پیرۆزیشدا شەیتان بێ هێزو بێ دەسەلاَت بوو ڕای كرد.

* ڕۆژووەوانانی مانگی ڕەمەزان خەڵكێكی ڕێزدارن لای خودای گەورە، هەروەك بەشداربووانی جەنگی بەدر بەڕێزت رینی خەڵكانی سەردەمی خۆیان بوون .

## جەنگی بەدر بۆچی هەڵگیرسا؟

بۆ بەرچاڕوونی هەندێ لە فەریكە موسڵمان و موسڵمانی دوودڵ بڕوا دانەمەزراو لەئایین زۆر بەكورتی و پوختی دەڵێین، جەنگی لەئاكامی نەفامی و خۆ بەزلزانی بێ باوەڕان دروست بوولەئەنجامی:

١ـ بەدەرنانی موسڵمانان لەماڵ و حاڵی خۆیان و زێدی باووباپیرانیان لەمەككەی پیرۆز بەرەو مەدینەی پیرۆز.

٢ـ دەست بەسەرداگرتنی هەرچی پارەوپووڵ ومال وسامان و زەوی زارو خانووبەرەی موسڵمانان.

٣ـ ڕێگری و چەتەیی كافرانی مەككە دەرحەق موسڵمانان و كۆچەران.

٤ـ زەبرو زەنگ و نیشاندانی هێزو بازووی خۆیان بەرامبەر موسڵمانە كۆچكردوەكان.

٥ـ چەوساندنەوەی موسڵمانان بەكوشتن و زەرەرو زیان لێدانی گیانی و ماڵی.

دوای ئەم هەموو شتانە ئینجا پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕێی پێدرا لەگەڵیاندا بجەنگی.

ئایا جەنگی بەدر لەپێناو ماڵ و سامان بوو؟

بۆوەڵامی ئەم پرسیارەش دەڵێین:

١ـ كافرەكان چەندین جار ماڵ و سامانی موسڵمانانین بەناڕەوا دەبردو دەستیان بەسەرداد دەگرت.

٢ـ كافرانی مەككەیی هەرچی ماڵی بەنرخ و گران بەهای خۆیان هەبوو لای پیغەمبەری خودایان دانابوو(ﷺ).

٣ـ بۆ بەخاوەن کردنەوەو گەڕاندنەوەی ئەو ماڵ و سپاردانە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ژیانی پێشەوا گەورەمان (عەلی) کوڕی (ئەبی تالیب)ی خستە مەترسیەوە تا بۆیان بگێڕێتەوە.

٤ـ کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی بەموسڵمانان کرد دەربچن بۆ کاروانەکەی مەککەیی، زیاتر مەبەستی چاو شکاندنی کافرەکانی مەککە بوو، دوایش خودای گەورە کردی پشتیشیان شکاو چەماوە.

بۆچی لەئیسلام کوشتاری بێ بڕوایان دروستە؟

خودای گەورە پێنج بە پێویست و گرنگ داناوە، چونکە ئەم پێنج شتانە سەنگی مەحەکی ژیانی مرۆڤایەتین و بەبێ پاراستن و ڕەچاوکردنی ئەم پێنجانە شیرازەی ژیان تێک دەچێت و، نالەبار دەبێت:

ئەوپێنج شتانەش ئەمانەن:

ا ـ ئایین: بۆ پارێزگاری ئایین جیهادو تێکۆشانی داناوە: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ۖ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَلَا عُدْوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ {سورەتی البقرە: ئایەتی١٩٣}

ب ـ مرۆڤ: بۆ پارێزگاری مرۆڤ کوشتنەوەی داناوە: ﴿ وَلَكُمْ فِى ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ {سورەتی البقرە: ئایەتی١٧٩}

ج ـ ناموس و ڕێزداری: بۆ پارێزگاری ناموس داری حەددی بۆ تۆمەتبار کردن خەڵکان داناوە: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾ {سورەتی النور: ئایەتی ٤}

د ـ نەوەو نەژاد: بۆ پارێزگاری نەوەو نەژاد داوێن پیسی (زینا)ی حەرام کردووەو داری حەددی داناوە: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ۖ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۖ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ {سورەتی النور: ئایەتی ٢ }

هـ ـ ماڵ و سامان: بـۆ پارێزگـاری مـاڵ وسـامان دەسـت بڕینـی دانـاوە: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ {سـورەتی المائدە: ئایەتی ٣٨ }

کەوابوو کوشتن و لەناوبردنیان بە پێویست (واجب) دەزاندرێت، کەسانێکن وەك سەرەتانن تا بمێنن ژیان و ژینگـە تێـك دەدەن و بۆگـەنی دەکـەن، چـاکترین چارەسـەرو دەرمـان قـەڵا چۆکردنیانە.

## بەرنامەی ڕۆژووەوان بۆ ڕۆژانی جەژن:

١ـ تەنها یەکجار کەل و پەل و پێویستیەکان بکرەو زۆر مەچووە بازاڕ.

٢ـ زیادەڕۆیی مەکە لەکڕینی شت ومەك و خواردن.

٣ـ ئەگەر خاوەن دوکان و بازرگانی کاڵاکان گران مەکە.

٤ـ بەخۆت و خێزانت و منداڵەکانت بڕۆن بۆ نوێژی جەژن.

٥ـ پیرۆزبایی لەخەڵکە نزیکەکانت بکە پێ بەپێ دراوسێیەکانت، دایك و باوك و خوشـك براکانت ...هتد.

٦ـ سەردانی خزم و دۆستەکانت بکە، بەتایبەت ئەوانەی پەیوەندیان لەگەڵدا بڕیوی.

٧ـ ئاگاداری زۆر خواردن و خواردنەوەو شیرنەمەنی بە.

بریاری گۆڕانکاری بدە:

ئەو گەرم و گوڕی و تام وچێژەی لەم مانگەدا چێژتت هەوڵبدە بەردەوام بیت.

# خەلاتی هەژدەهەمین

## چۆن پلە بەرزەکانی بەهەشت بەدەست دێنیت

براو خوشکانی بەرێز: ئێمەی موسڵمان لەو سەردەمەی ئێستا هەرچەندی هەوڵ و تێکۆشان دەکەین و ماندووین هێشتا هەر پێمان وایە کە دەتوانین ئیش و کاری تر بکەین ،بەڵام ئێمە تەمبەڵی دەکەین و، خۆمان ماندوو ناکەین، بۆ هەوڵدان و بەدەست هێنانی دونیا زۆر بەتەماع و سوورین و، پێشبڕکێ دەکەین، وەك خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ يَعْلَمُونَ ظَـٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْـَٔاخِرَةِ هُمْ غَـٰفِلُونَ ﴾ {سورەتی الروم: ئایەتی ٧} واتە:(ئەوانە هەر رواڵەت لەژیانی دونیا بەدی دەکەن، لەبەرامبەر قیامەتیشەوە بێ ئاگان)

بۆیە بزانە ئەگەر دونیایەکی کەم و کورت و کاتی ئەوەندە پێویستی بەوهەموو ماندووبوونە بێت، ئەی ئەو هەموو کوسپ و تەگەرەو ناخۆشیانەی لەدوا ڕۆژ دێتە ڕێگامان، ئایا زیاتر پێویستی بەخۆ ماندوو کردن و هەوڵ و کۆشش نیە، موسڵمانانی ئەو سەردەمەی ئێستا زۆر بێ تەماع و بێ خەمن بۆ زادو زەخیرە توێشوی قیامەت، بەڵکو هەندێ کەس زۆر لەخۆبایین بە کارو کردەوەکانی خۆیان دەڵێن: ئێمە چیمان کردووە؟ زەلامان کوشتووە، زینامان کردووە، بەم شێوە خۆی بەراوورد دەکات لەگەڵ خەڵکی زەلام کوژو، داوێن پیس، خۆی بەراوورد ناکات لەگەڵ خواناسان و پیاوانی شەوونوێژخوێن و خۆبەخش وماڵبەخش لەپێناوی خودای گەورەومیهرەبان،یابەس تەنها ڕەحمەت و میهرەبانی و لێخۆشبوونی خودای گەورەی لەبیرە، هەرگیز بیر لە تووڕەبوون و سزاو تۆڵەی خودای گەورە ناکاتەوە.

ڕۆژووەوانانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز: بزانن بەهەشت کاتێك بەدەست دێت کەتۆ بای ئەوەندە کردەوەت هەبێت کەخۆتی پێ ڕزگار کەیت لەئاگری دۆزەخ، دوای ئەمە کردارە چاکەکانت زۆر زیاتر بێت لەخراپەکان ئینجا تۆ دەچیتە بەهەشت بەبێ سووتان و ئازار وەك خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ

ٱلۡقِيَـٰمَةِۖ فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَۗ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴾ {سورەتی آل عمران: ئایەتی١٨٥} واتە: (هەموو کەسێك دەبێت بمرێت و مردن بچێژێت، تەنها لە رۆژی قیامەتدا کرێ و پاداشتان بەتەواوی پێ دەدرێت (دەرەنجامی کردەوەکانتان دێتەوە رێتان) ئەوسا ئەوەی دوور خرایەوە لەئاگری دۆزەخ و خرایە بەهەشتەوە، ئەوە بەراستی سەرفرازبووە، ژیانی دونیاش بێجگە لەوەی کە رابواردنێکی خەڵەتێنەرە شتێکی تر نیە)

کەوابوو بزانە ئەو کردەوانەی دەی کەیت تۆ نابێتە خاوەنی هەمووی و هەرهەمووی نرخی بەهەشت نیە:

* هەندێ کەس یا هەندێ لەکردەوەکان دڵسۆزی و خۆ یەکلاییکردنەوەیان تێدا نیە بۆیە نابێتە خاوەنی هیچ و بەڵکو لەسەریشی قەرزا دەبێتەوە وەك خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَـٰشِيَةِ ۝١ وُجُوهٌ يَوۡمَئِذٍ خَـٰشِعَةٌ ۝٢ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ۝٣ تَصۡلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴾ {سورەتی الغاشیە: ئایەتی١ـ٤} واتە: (ئایا هەواڵ و دەنگوباسی قیامەتت پێگەیشتووە؟!(رۆژێکە سەختیەکەی هەموو کەسێك داگیر دەکات) * لەو رۆژەدا چەند روخسارانێك خەجاڵەت و رەنگ زەردو شەرمەزارو زەبوونن * (هەر یەك لە خاوەنی ئەو روخسارانە) ئیشکەرێکی شەکەت و ماندوون (بۆ بەدیهێنانی دونیای دوور لەئیمان) * دەچنە ناو ئاگرێکی سووتێنەرەوە (جەستەکەی لەناو نابات بۆ ئەوەی هەر لەسزادا بمێنێتەوە)).

* هەندێ لەکردەوەکانمان گوناهو تاوان و خراپەکاری دەیخوات و لەناوی دەبات وەك پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرمووێ: ((أتدرون من المفلس؟ قالوا: المفلس: فينا من ليس له درهم ولا متاع له. فقال: إن المفلس: من أمتي يأتي يوم القيامة بصلاة وصيام وزكاة ويأتي وقد شتم هذا، وقذف هذا وأكل مال هذا وسفك دم هذا وضرب هذا فيعطى هذا من حسناته وهذا من حسناته فإن فنيت حسناته قبل أن يقضى ما عليه أخذ من خطاياهم فطرحت عليه ثم طرح في النار)) {بوخاری و موسلم گێراویەتیانەوە}

واتە: (ئایا دەزانن دەست بەتاڵ کێیە؟ ووتیان: دەست بەتاڵ: لای ئێمە ئەو کەسەیە کەدرهەم و دینارو کەل و پەلی نەبێت. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: بەڵکو دەست بەتاڵ

لەئوممەتی من ئەو کەسەیە لەڕۆژی دوایی بەنوێژو ڕۆژوو زەکات و چاکەوە دێت بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشدا جوێنی بەو داوەو بوختانی بەو داکـردووەو مـاڵی ئـەوی خـواردووەو خـوێنی ئـەوی ڕشتووەو لەوی داوە بۆیە ئەو هەندێ چاکەکانی دەبات و ئەوی تر هەندێکی دەبـات تـا هـیچ چاکەیەکی نامینێت داواکاری خەڵکیشی هەر بەسەر ماوە ئینجا خراپـەکانیان دەخەنـە سـەر لەکۆتاییشدا دەخرێتە ناو ئاگری دۆزەخ).

هەندێ کەسیش کردەوەکانی تەنها رزگاری دەکەن لەئاگری دۆزەخ و بەس.

هەندێ کەسیش تەنها دەچێتە بۆ هیچ پلەیەك لەپلەکانی بەهەشت بەرزنابێتەوە.

هەندێ کەسیش خەڵکی ئاسایی وەك من و تۆن بەڵام لەپلەی پێغەمبـەران و شـەهیدان و ڕاستگۆیانن.

ئـیبن و(عەسـاکر) لـەکتێبی (تـأریخی دیمەشـق) دەگێڕێتـەوە: لەسـەردەمی گـەورەمان پێشەوا(عومـەری کـوڕی خـەتتاب) (خـودا لێـی رازی بێـت) گـەنجێکی خوانـاس بـەردەوام لەمزگەوت بوو پیشەوا(عومەر) زۆری خۆش دەویست ئەو گەنجە باوکی بەساڵاچوو بەتەمـەنی هەبوو کەنوێژی (عیشا) خەتنانی دەکرد دەچووە خزمـەت بـاوکی هەرپێویـستیەکی هەبوایـە بۆی جێ بەجێ دەکرد ماڵی ئافرەتێك لەسەر ڕێگای ماڵی باوکی بوو، ئەو ئافرەتـە چـاودێری ئەو گەنجەی دەکرد هەوڵی دەدا بەهەر جۆرێك بێت ئەو گەنجـە ببینێـت و هـەڵی بخەڵـەتێنێت شەوێك ئەو گەنجە بەبەر دەرگاکەیاندا تێپـەڕی بـەردەوام هـەوڵی لەگەڵیـدا تـا وای لێ کـرد شوێنی بکەوێت کاتێ چووە پێش دەرگاکەو چووە ژوورەوە خودای گەورەی بەبیر هاتەوەو زانی کارێکی نارەواو نادروستە وەك خودای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴾ {سـورەتی الأعـراف: ئایـەتی ٢٠١} واتـــە: (بەڕاستی ئەوانەی کە پارێزگارو تەقوادار بوون، کاتێك خەتەرەو خەیاڵێك لەلایەن شـەیتانەوە تووشیان بێت، ئەوە خێرا بێدار دەبنەوە، ئیتر دەستبەجێ بینا دەبن و بەرچاویان ڕوون دەبێـت (ڕێبازی ڕاست بەدی دەکەن و لێیان ناشێوێت).

کاتێ ئەو گەنجە هەستی بەتاوان و گوناهی خۆی کرد و هاتەوە سەربیروهۆشی خۆی لەهۆش خۆی چوو ئاگای لەخۆ نەماو، لەبەر دەرگای ماڵی ئافرەتەکە کەوت ئافرەتەکە بانگی خزمەت چیەکەی خۆی کردو تایارمەتی بدات بۆ بردنەوەی لاشەکەی ئەو گەنجە لەبەر دەرگای ماڵی باوکی دایان نا، کاتێ باوکی هاتەدەر کورەکەی بینی بەبێ هۆشی لەبەر دەرگا کەوتووە بانگی چەند کەسێکی کرد تا بیبنەوە ژوورەوە بەبێ هۆشی ماوە تا درەنگانێکی شەو دوای ئینجا بەهۆش خۆی هاتەوە باوکی لێی پرسی رۆڵەگیان چیت بەسەرهاتووە؟ ووتی: خێرە . باوکی پرسیاری لێی کردەوە ئینجا بەسەرهاتەکەی بۆ باوکی گێرایەوەو ووتی: رۆڵە گیان چ ئایەتێکت خوێندووە واکاری تێکردی ئایەتەکەی بۆ خوێندەوە لەهۆش خۆی چووەو کاتێ جوولاندان گیانی سپاردوو هەر بەو شەوە ئامادەیان کردو بەخاکیان سپارد کە بەیانی داهات هەواڵەکەیان بەپێشەوا (عومەر) گەیاند(خودا لێی رازی بێت) چووەلای باوکی سەرەخۆشی لێ کردو نارەزایی دەربری و فەرمووی: بۆچی کاتی شاردنەوەی هەواڵتان پێ نەدام ووتی: ئەی پێشەوای بڕواداران کاتەکە شەوبوو نەمان ویست ئەزیەتت بدەین فەرمووی: کەوتە فەرموون بابچینە سەر گۆرەکەی کە چوونە سەر گۆرەکەی پێشەوا(عومەر) فەرمووی: ئەی فلان: ﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴾ {سورەتی الرحمن: ئایەتی ٤٦} گەنجەکەش لەناو گۆرەکەی وەڵامی دایەوەو ووتی ئەی (عومەر) خودای گەورە دوو جار ئەو دوو بەهەشتانەی پێمداوە)

ئەگەر سەیری ئەو کەسانە بکەین و ووردببینەوە لەبارودۆخ و ژیان و گوزەران و مردنیان ئەو کاتە دەزانین ئایا ئێمە بۆ بەهەشت هەوڵمان داوە یان نا؟

بزانە بەهەشت:

زۆر بەنرخە!

زۆر گەورەو فراوانە!

زۆر خۆش و جوانە!

زۆر پاك و بێگەردە!

جێگای پاك و چاکانە!

**نرخەکەی:**

بەخشینی گیانە لەپێناوی خوای تاك وتەنیا: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ ۚ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ ۖ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ وَٱلْقُرْءَانِ ۚ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِ ۚ فَٱسْتَبْشِرُوا۟ بِبَيْعِكُمُ ٱلَّذِى بَايَعْتُم بِهِۦ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ {سورەتی التوبە: ئایەتی١١١} واتە: (بەڕاستی خوا گیان و ماڵی لە ئیمانداران کڕیوە بەوەی کە بەهەشت بۆ ئەوانەو بەشیانە (بەڕاستی پەروەردگایکی بەخشندەیە، هەر بەخشێنەری گیان و ماڵ و سامانە، کەچی ئاوا مامەڵە دەکات لەگەڵ ئیمانداو نرخێکی نەبڕاوە، نرخێکی زۆر گەورەی بۆ بڕیارداوە، کاتێك لەپێناوی ئەودا دەیبەخشن) ئەوانە دەجەنگن لە پێناوی ئایینی خوادا، دوژمنانی ئایینی خوا دەکوژن، (لە گۆڕەپانی جەنگدا)، یان دەکوژرێن و (شەهید دەکرێن)، ئەو پاداشت و بەڵێنە بەڕاستی لەسەر خوایەو باس کراوە لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا، جا کێ هەیە بەقەدەر خوا بەوەفاو بەئەمەك بێت بۆ جێ بەجێ کردنی بەڵێنەکانی، کەواتە زۆر دڵخۆش و کامەران بن، بەو مامەڵەیە کە ئەنجامتانداوە و بەو فرۆشتن و کڕینەی کە لەسەری ڕێککەوتوون، بێگومان هەر ئەوەشە سەرفرازی و سەرکەوتنی نەبڕاوەو بێ سنوور)

بەخشینی بەنرخترین و خۆشەویسترین ماڵە:﴿ لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴾ {سورەتی آل عمران: ٩٢} واتە: (ئێوە هەرگیز ناگەنە پلەی چاکی و چاکەکاری هەتا لەو شتانەی کە خۆشتان دەوێت نەبەخشن، هەر شتێکیش ببەخشن ئەوە خوا ئاگادارو زانایە پێی (لێی ون نابێت و بێ پاداشت نابێت))

ترسی خودای گەورەو وازهێنان و نەگۆڕینەوەی خۆشی یەکانی بەهەشت بەدونیاو جوانیەکانی دونیا: ﴿ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴾ {سورەتی النازعات: ئایەتی ٤٠-٤١} واتە: (بەڵام ئەوەی لەپایەو شکۆی پەروەردگاری

ترسابێت و حسابی بۆ کردبێت و جلەوی نەفسی گرتبێتەوە لەهەموو هەواو هەوەس و ئارەزوویەکی نادروست * بێگومان هەر بەهەشت جێگای مانەوەو حەوانەوەو گوزەرانیەتی)

براو خوشکی بەرێز: وانەزانی ئیسلامەتی و دینداری تەنها کۆبویتەوە لە نوێژو رۆژوو زەکات و حەج و عومرە، نەخێر ئەگەر ئەم کردەوانە نەت گۆرێت لەخراپە بۆ چاکەو بەرە چاکتر هەنگاوت پێ نەنێت و گێچی بڕواو ئیمانەکەت بەرز نەکاتەوەو رەوشت و ئاکارو هەڵسوکەوتی رۆژانەت نەگۆرێت، کردەوەو کارەکانت لەسەر بنەماو بیرو باوەرێکی دامەزراوو تەواو نەبێت بزانە هەر کردەوەکانت لێ وەرناگرێت و بەرووت دادەدرێتەوە بۆ ئەمەش گوێ بگرە لەم رووداوە راستەقینە:

موسڵمانێك ووتی من لەگەڵ یەکێ لەو حیزبە عیلمانیانە بووم کە بڕوایان بەخودای گەورەو ئاین نەبوو تەنها بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵك و دەوروبەرەکەی خۆیان خۆیان بەموسڵمانو دیندار نیشان دەدا، دەڵێت منیش بەروح و گیان لەگەڵ ئەو لایەنە بووم، هەرچەندە من باوەرم هەبوو نوێژو رۆژووم دەگرت، تا شەوێك خەونێکم بینی لەوخەوەدا لە گۆرەپانی حەشربووم رۆژی دوایی بوو دیارە رۆژی حەشر چ رۆژێکی ناخۆش و تەنگ وتاریك و پڕ لە ناخۆشی و نەهامەتی و زەحمەتی یە، بەڵێ لەو رۆژە رەش و ناخۆشە لەناکاو خەڵکان وەك لێشاو بەرە کەسێك رۆیشتن کاتێ سەرنجمدا بینیم پێغەمبەری خودایەو خەڵکان بەرەو رووی دەچن تا لەدەستی پیرۆزی ئاوی کەوسەر بخۆنەوەو شەفاعەتیان بۆ بکات، منیش زۆر بەدڵخۆشیەوە بەرەو رووی چووم بەڵام کەلێی نزیك بوومەوە رووی لێ وەرگێرام و تەنیشتی لێ کردم، زۆرپەرێشان بووم چونکە زانیم پێغەمبەری خودا لێم توورەو زوویرە، سوورامەوە چوومە بەرامبەری ووتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) منیش ئوممەتی تۆم پشتی تێکردم و ووتی: نەخێر تۆ ئوممەتی من نی بەڵکو تۆ ئوممەتی فڵانە کەسی ناوی سەرکردەکەی هێنا.

ئەمە رەزانە مانگی گۆرانکاریە مانگی بەدەست هێنانی بەهەشتە، نەکەی شەیتان فریوت بدات و هەڵت بخەڵەتێنێ، بەزۆر کردەوەکانت بێتە پێش چاو.

زۆرکەس کاتێ دەبیستێ شەوی قەدر ئەوەندە خێرو پاداشتەی هەیە، بـەڕۆژووبوونی ڕۆژی عەرەفە خێری دووساڵی هەیەو، نوێژەکان گوناهو تـاوان ڕەش دەکاتـەوەو...هتـد دەڵێـت: چ پێویست دەکات ئەوەندە هەوڵبدەین و خۆمان ماندوو بکەین؟!

براو خوشکی ئازیز: بزانە تەنها ووتنی یەك (سبحان الله) دار خورمایەکت بۆ لەبەهەشـت دەچێندرێت، کەوابوو ئەگەر تۆ یەك(سبحان الله) زیاتر بکەیت دار خورمایەکت لە خەڵکی تر زیاترە.

کەوابوو بۆ هەوڵنادەیت بۆ پلە بەرزەکانی بەهەشت!

**بەرنامەی رۆژووەوان:**

١ـ بۆئەوەی ببیت بەخۆشەویست و دۆسـتی پێغەمبـەرو (ﷺ) تکـا (شـەفاعەت)ت بـۆ بکات زۆر (سەلاوات)ات لێبدە.

٢ـ تا تکا (شەفاعەت)ی پێغەمبەری خـودای گـەورەت (ﷺ) بـۆ حـەلال بێـت هـەرگیز دوعاو پاڕانەوەی وەسیلەی دوای بانگ بخوێنە.

٣ـ چاودێری بێ باوك و ئافرەتی بێ مێرد موسڵمان پێی لەپێغەمبەری خـودا(ﷺ) نزیـك دەبێتـەوە بۆیـە لـەو ڕەمەزانـەوە بەدەسـتە جـەمعی لەگـەڵ چـەند کەسـانێك لەهاوپیـشەو موسڵمانێك برە پارەیەك کۆبکەنەوە بۆیان.

بریاری گۆڕانکاری بدە:

بیرێـك لەڕەوشـت و ئاکارەکـانی خـۆت بکـەوە بزانـە چـۆنی و چ ڕەوشـت و ئاکـارێکی ناموسڵمانانەت هەیە وازی لێ بهێنەو، بەتایبەت (خۆبەگەورەزانی) چونکە کەسـانی ڕەوشـت خراپ ناچێتە بەهەشت بەتایبەت ئەوەی (خۆی بەگەرە بزانێت)

# خەلاتی نۆزدەهەمین

## ئافرەت لەئیسلامدا شاژنە

برای ڕۆژووەوان: خوداپەرستی و عیبادەت بەهەموو جۆرەکانیەوە ئەگەر گۆڕانکاری دروست نەکرد لەسەر هەڵسوکەوت و ویژدان و ڕەوشت و ئاکارەکان و ژیانی ڕۆژانەتی نەگۆڕی، موسڵمانی ژیر و تێگەیشتوو پێویستە زوو بەخۆدا بچێتەوەو، بەرلەوەی ڕۆژێك دابێت کردەوەکانت بەڕووتدا بدرێتەوە.

برای گەورەو بەڕێزم: بۆ ئەم مەبەستە کوێ لەڕووداوە ڕاستەقینە بگرە بزانە موسڵمانی خودا ناس دیندار چۆن خەم لەدین و دواڕۆژی کچەکانی خۆی دەخوات:

موسڵمانێکی ئەو شارەی خۆمان وەك هەموو باوکێك خاوەن چەند کچێکە ئەو پیاوە کاتێ کچەکەی دەگاتە تەمەنی شووکردن هەروەك بۆ کوڕەکانی بەدوای ئافرەت و کچی باشدا دەگەڕا بەهەمان شێوە بەڵکو زیاتریش بەدوای گەنجێکی خوداناس و بەڕەوشت دەگەڕا بۆ کچەکانی، ئەو پیاوە موسڵمانە بەیانیەك دەچێتە مزگەوت بۆ نوێژی بەیانی کەدەچێت کەنجێکی دیندارو خوداناس دەبینێت، لە سوچێکی مزگەوتەکە نوێژێکی زۆرجوان دەکات سەرنجێکی زۆر ووردی دەدات دوای لەدەرەوەی مزگەوت چاوەڕوانی دەکات تا دێتە دەرەوە کە دێتە درەوە لە مزگەوت سەلامی لێ دەکات و دوای چەند پرسیارو وەڵامێك، لێی دەپرسێت پێی دەڵێت: ئایا خێزانداری؟ ئەو کەنجە خوداناسەش دەڵێت: نەخێر هێشتا ژنم نەهێناوە؟ ئەو موسڵمانەش پێی دەڵێت: من کچێکم هەیە ئەگەر بتەوێت ئامادەم پێشکەشت بکەم.
بێگومان ئەو گەنجە بەڕێزە زۆر شەرم لەخۆی دەکات و لەشەرمان ڕەنگی تێك دەچێت و ئارەقەیەکی زۆر دەکات بەڵام دەیەوێت خۆی لەم بابەتە ڕزگار بکات بۆیە بەشەرمەوە دەڵێت: ئینشاالله دوایی وەڵامت دەدەمەوە دوای چەند ڕۆژێك هەر ئەو پیاوە خاوەن کچە یەخەی دەگرێتەوەو بۆ وەڵامەکە پێی دەڵێت چ بوو وەڵامەکەت نەدامەوە ئەوگەنجەش زۆر بەشەرم و شکۆوە دەڵێت: (والله) خزمایەتی جەنابتم زۆر پێ خۆشە بەڵام ئێستا باری داراییم باش نیەو

ناتوانم ژن بهێنم، ئەو موسڵمانە خوداناسە دەڵێت: مـن هـیچ شـتێکم لـەتۆ ناوێـت و تـەنها سەرسامم بەتۆ چونکە کەسێکی دیندارو بەڕەشتی کەوابوو پارەو پول و دارایی هـیچ گرفـت و کێشەیەك نیە.

دوای چەند ڕۆژێك زەرفێك پارەی پێ دەدات و پێی دەڵێت: ئەمە پارەی مارەییە بۆ خۆت ژنی پێ بهێنە.

ئینجا ئەو گەنجە دایك و چـەند ئافرەتێـك دەنێرێـت بـۆ مـاڵی ئـەو پیـاوە موسـڵمانەو بەشەرعو ئاینی ئەو کچە مارە دەبڕێت، ئەو پیاوە موسڵمانە دەڵێت: چۆن مـاڵم بـۆ کوڕەکـانم داناوە کاتێ کەژنیان هێناوە بەهەمان شێوە ئەوەی ماڵ پێویستی بوویێـت بـۆ ئـەم کـچەم و زاوایەم داناوەو بۆم دەستەبەر کردوون، وە یەکێ لە دوکانەکانم پێداوەو تا ئیش و کـاری تێـدا بکات و بژێوی ژیانی خۆی پەیدا بکات.

دایك و باوکی ڕێزدار: ئەمـە موسـڵمانێکە بـەڵام موسـڵمانێکی ڕاسـتەقینەو بـەکردەوە موسڵمان ودیندارە بۆیە چۆن خەمخۆری لایـەنی مـاددی و خـۆراك وپۆشـاکی منداڵەکانیـەتی بەهەمان شێوە خەمخۆری لایەنی دەروونی و نـاخ و پـەروەردەو پێگەیانـدنی منداڵەکانیـەتی، چونکە زۆر چاك حاڵی لەئایـەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ﴾ {سـورەتی التحريم: ئايـەتی٦} واتە: (ئەی ئەو کەسانەی کەباوەڕتان هێناوە خۆتان و کەسو کارتان بپارێزن لە ئاگرێـك کەسـووتەنیەکەی خـەڵکی و بـەردە، سەرپەرشـتیاری ئـەو دۆزەخ وئـاگرە، جـۆرە فریشتەیەکن کە زۆر دڵڕەق و تونـدو تیـژن، نافـەرمانی خـوا ناکـەن لـە هـیچ شـتێکدا کـە فەرمانیان پێ بدات و هەرچی فەرمانێکیان پێ بدرێت ئەنجامی دەدەن)

دەبا سەیرێکی هەڵسوکەوتی هەندێ لەباوك و براکانی ئەو سەردەمە بکەین، کـە خۆیـان بە موسڵمان و دەسگرتوو بەدین دەزانن و خەڵکێکی نوێژخوێن و هاموشۆی مزگەوت دەکـەن بۆ نوێژی بە کۆمەڵ و ئامادەی ووتاری ڕۆژانی هەینی دەبن، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ڕێزێـك بـۆ کچ و خێزانیان ناکەن، کچانی خۆیان لەماڵ دەهێڵنەوەو بەشوو نـادەن بـێ هیـواو ئومێـدیان

دەکەن لەژیان وخۆشیەکانی ژیان، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێ: ((من ولد له ولد فليحسن اسمه وأدبه فإذا بلغ فليزوجه فإن بلغ ولم يزوجه فأصاب إثما فإن إثمه على أبيه))رواه البيهقي واتە: (ئەوەی خودای گەورە منداڵێکی پێ ببەخێت باناوێکی خۆش وباشی لێ بنێت و فێری رەوشتی بکات کاتێ گەورەبوو گەیشتە تەمەنی ژنهێنان و شووکردن باژنی بۆ بهێنێت، ئەگەر کچیشە با بەشووی بدات، کەگەیشتە ئەو تەمەنەو ژنی بۆ کورەکەی نەهێناو کچەکەی بەشوو نەدا ئەو کچ وکورە گەنجە هەر خراپەو گوناهێك بکەن، باوکەکەیان هاوبەشی گوناهەکەیە)

باوك وبرای موسڵمان بزانە رەچاوکردن و گرنگیدان بە کچ لەئایینی پیرۆزی ئیسلام و سووننەتی پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) شتێکی روون و بەرچاوە، بەتایبەت لەو رۆژگارەی ئەم سەردەمەی ئێستا.

## ئافرەت لەئیسلامدا:

* نۆبەرەی کچ نیشانەی خێرو بەرەکەتی ئەو خێزانەیە کە نۆبەرەکەیان کچە.

* ئەوەی دووکچ بەخێوو پەروەردە بکات دەچێتە بەهەشت.

* خودای گەورە بۆ خۆی(سبحانه وتعالى) بەرگ پۆشاکی ئافرەت دیاری کردووەو باسی لێوە کردوە.

* سورەتێکی تەواو بەناوی سورەتی (نساء)ە.

* پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەرە مەرگدا ئامۆژگاری و وەسیەتی بە ئومەتەکەی کرد کە چاکە بکەن لەگەڵ ئافرەتان.

* رێزی دایك بەسێ پلە لەسەر رێزی باوکدایە.

* ئافرەت بەتەواوکەرو بنچینەی کۆمەڵگەی موسڵمان هەژمار کراوە.

* پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو کەسەی رێز لەئافرەت دەگرێت بە کەسێکی بەرێزی ناوبردووە، ئەوەی سوکایەتی پێ دەکات و رێزی لێ ناگرێت بەکەسێکی سوك و بێ ناو بردووە.

## ئامۆژگاری بۆخاوەن کچ وسەرپەرشتیارانی کچ:

١ـ پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێ: ((إذا أتاكم من ترضون دينه وخلقه فزوجوه وإلا تكن فتنة وفساد كبير)) واتە: (ئەگەر کەسێك هاتە خوازبێنی کچەکەت لەدین و ڕەوشتەکەی ڕازی بووی کچەکەتی لێ مارە بکەو پێی بدە ئەگەر وانەکەیت بەڵاو خراپەکاری بڵاو دەبێتەوە)

٢ـ ئەگەر گچێك کوڕێك هاتە خوازبێنی، یاکوڕێك کچێکی ویست، ڕێگری مەکە لەدروستبوونی ئەو هاوسەرگیریە، ئەگەر ڕەزامەندیت لەسەر نەبوو، کوڕەکەت یاکچەکەت بانگ بکەو ئەو هۆیەی بۆ ڕوون بکەوە لەبەرچی تۆ بەم هاوسەر گیریە رازی نیت.

ئەگەر ئەو هۆو پاساوەی تۆ لە ڕووی دین وئایینەوە ڕێی تێ نەدەچوو بەهیچ شێوەیەك ئەو هاوسەرگیریە دروست ببێت، ئەو کاتە هەوڵی نەهێشتنی ئەو ڕێگریە بدە نەمێنێت، بۆنموونە کەسێکی نوێژنەکەر دێتە خوازبێنی کچەکەت تۆ نیگەرانی لەدروستبوونی ئەو هاوسەرگیریە، لەبەر نوێژنەکردنەکەی، بۆیە هەوڵبدە لەسەرەتاوە دوژمنایەتی لەگەڵ ئەو زاوایە یا ئەوبوکەت دروست مەکە، بەڵکو با کچەکەت یا کوڕەکەت ببێتە کلیلیلکی تر بۆ تۆ ئەی باوك بەهەشتەکەت بەرێ نیشاندانیان بۆ ڕێگای چاك و باش.

٣ـ داواکردنی مارەیی زۆرو بارگران کردنی زاوا لەلایەن دایك و باوك و برای کچەکە، لەو کاتەشدا کێشەو گرفت بۆ کچەکەی خۆیان وزاواکەیان، (هەروەك خێرو بەرەکەتی ئافرەت لەوەدایە کەمارەییەکەی کەم بێت).

٤ـ خەڵکانێکی نەفام بەچاوێکی کەم و سووك سەیری زاوای خۆیان دەکەن، وەك باوە دەڵێن: (زاوا کەری خەزورە)بەڵام لە دیدو بۆچوونی ئایین و سوونەتی پێغەمبەری سەروەرەوە(ﷺ) خێر: (زاوا کوڕی خەزورە).

## * كێ دەكەیت بە هاوسەرو هاوژینی خۆت:

### كوڕی گەنج ولاو ئەو ئافرەتە هەڵبژێرە:

كە دیندارو خواناسە.

خوێندەوارو ڕۆشەنبیرە.

خاوەنی دایكێكی باش وچاكە.

لەبنەماڵەیەكی ناودارە.

خاوەنی سامان و ماڵێكی مام ناوەندی بێت.

كابان و خاتونی ماڵ بێت.

هیچ پێشینەیەكی دڵداری و چاو چاوانێی نەبێت.

### * كچانی بەرێزو خوشكی تۆش ئەو كوڕە هەڵبژێرە:

دیندارو خواناس بێت.

خاوەن پیشەو كار بێت.

خاوەنی بنەماڵەیەكی دیارو نادیار بێت.

كەسێكی خوێندەوارو ڕۆشەنبیر بێت.

هیچ پێشینەیەكی دڵداری و چاوچاوانێی نەبێت.

بۆ هەردوو ڕەگەز زۆر ئاگاداری ئەم خاڵانە بە:

كەسێكی بێ دین و بێ ڕەوشت هەڵمەبژێرە بەئومێدو نیازی چاكردن و بانگەوازی كردن.

كەسێك كە مایەی كێشەو گرفتەو كێشە لە دروستبوونی هاوسەرگیریەكەدایە.

كەسێكی بەنیازی ئەو كەسە بێت و هێشتا بەیەكجاری دەستی لێ هەڵنەگرتووە.

ئەگەر كەسێكت هەڵبژارد زۆربەی ئەنـدامانی خێزانەكـەت یاچـەندین كەسـی هۆشمەنـدو تێگەیشتوو بەو هاوسەر گیریەی تۆ رازی نەبوون دەستی لێ هەڵبگرەو وازی لێ بێنە.

**هەرگیز ئەم دوو شتە لەبیر مەکە بۆ هەموو کارێکی گرنگی ژیانت:**

یەکەم: نوێژی إستخارە.

دووەم: پرس و ڕاوێژ کردن بەخەڵکی شارەزاو خواناس.

بەرنامەی ڕۆژانەی تایبەت بەخوشکانی بەڕێز:

١ـ برای گەورەم: بزانە خێزان و خوشك و کچەکەت وەك تۆ مرۆڤەو دەمرێت و پێویستی بەپاداشت عەیە.

٢ـ خوشکی بەرێز: خەمخۆری دوارۆژی خۆت بەو ئەومانگە هەرتەنها لەمەتبەخ بەسەر مەبە.

٣ـ خراپترین شوێن بازاڕەکانە بۆیەخۆتی لێ بپارێزەو زۆر مەچوو.

٤ـ خوشکی خۆم هەفتەی ڕۆژێك یادوو ڕۆژ تەرخان بکە بۆ کڕینی کەلّ و پەلەکانی ماڵەوە.

٥ـ پێویستە موسڵمان لەو مانگەدا زۆرئاگاداری زیادەڕەوی کردن بێت لەخەرجی و خواردن.

٦ـ هەوڵبدە لەو چێشت و خواردنانەی ئامادەی دەکەیت بەدەستی خۆت لێی ببەخشەو تا خێری ڕۆژوو پێ شکاندن ژووەوانانت پێ بگات .

٧ـ خوشکی لەمەتبەخەکەت بێ ئاگامەبە لەزیکرو قورئان بەکوێ ڕاگرتن لەڕادیۆ یاتەسجیل یامۆبایل .

بڕیاری گۆڕانکاری بدە:

خوشکی بەرێز: پیاوەکەت بەهەشت و دۆزەخی تۆیە بۆیە بزانە تا ئێستا تاچەند ڕەچاوی مافی پیاوەکەت کردووە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێ: ((إذا صلت خمسها، وصامت

شهرها، وأطاعت زوجها، دخلت جنة ربهـا)) واتە: (ئەگەر ئافرەت هەر پێنج نوێژە فەرزەکانی بەتەواوی کرد، وەمانگی ڕەمەزان بەتەواوی بەڕۆژووبوو، گوێڕایەڵی پیاوەکەی کـرد، دەچـێتە بەهەشتەکەی خودای گەورەو میـهرەبان).

# خەلآتی بیستەمین

## خۆشویستن یا خۆکوشتن

بەر لەوەی ئەم بەسەرهات و چیرۆکەتان بخەمە بەر دیدی ئێوەی کچ و کوڕانی بەڕێز ئەم چەند پرسیارەتان ئاڕاستە دەکەم:

بۆچی خۆشەویستی (دڵداری) دروست نی یە؟

ئایا دەقی ئایەت فەرموودەی لەسەرە کە حەرامە؟

زەرەرو زیانی خۆشەویستی چی یە؟

کوڕی بەغیرەت ئایا رازی دەبێت کەسێك دڵداری خۆشەویستی لەگەڵ خوشکت بکات؟

کچی بەڕێز ئایا دڵنیایی لەو کوڕەی کەخۆشت دەوێ جگە لەتۆ کەسی تری خۆش ناوێت؟

دەفەرموون ئێستا بە یەکەوە باسی ئەو ڕووداوە ڕاستەقینەتان بۆ بکەم کە چەندمانگێك پێش ئەم ڕەمەزانەی ئەم ساڵ (١٤٣٣) ڕۆژێك لەگەڵ مامۆستایەکی بەڕێز تەکسیەکمان ڕاگرت، کاتێ لە جامەکە سەیرم کرد زۆر سەرقاڵبوو بە مۆبایلەکەی قسەی لەگەڵ کەسێك دەکرد، ئێمەش سەرکەوتین ڕێگادا ئۆتۆمبێلەکەی لێدەخوڕی و بەردەوام قسەشی دەکرد، ماوەیەك ڕۆیشت هێشتا پێیمان نەووتبوو دەچین بۆ کوێ تەنها بەدەست ئاماژەم دەکرد کە چۆن و بەچ ئاڕاستەیەکدا بڕوات، سەرەتا وا تێگەیشتم کە کێشەی خێزانی هەیە، دوایی تێگەیشتم کە (عاشق)ە، خۆشەویستەکەی بەنهێنی ئەو پەیوەندی لەگەڵ کوڕە خاڵێکیشی داناوەو کوڕە خاڵەکەی ئەو کچەبوو بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵ ئەو گەنجە دەکردو، داوای لێ دەکرد کەواز لە کچە پوورەکەی بهێنێت، چونکە قسەی لەگەڵ پووری و باوکی کچەکە کردووەو بەڵێنیان پێیداوە کە بەوی بدەن،دوایی گفتوگۆو قسە کردنێکی زۆر لەگەڵ کوڕی خاڵی خۆشەویستە درۆزنەکەی شوێنێکیان دەسنیشان کرد کەیەکتر ببینن.

مۆبایلەکەی داخست و دوای داوای لێبوردنی کردن زۆر بەپەرۆش و بێزاریەوە ڕووی لەمن کردو ووتی: مامۆستا (واللە) ئەو دونیایە تێکچووەو کەس ڕاست نەماوە.

منیش ووتم: بۆ چی بووە؟

ووتی: (واللە) مامۆستا پێنج ساڵە کچێکم خۆش دەوێت، هیچ شتێك نەماوە بۆم نەکردبێت، بەم ئۆتۆمبێلەی خۆم چەندین شوین گەڕاندوومە، چەندین پارەم لێی خەرج کردووە، ئینجا ئێستا خیانەتی لێ کردوم و بەبێ ئاگایی من پەیوەندی لەگەڵ کورە خاڵی داناوە.

بەڕاستی من پێکەنینم بەقسەکانی دەهات و لەلایەك دڵم بۆی دەسووتاو، لەڕوویەکیش سەیرم بەو غیرەتەی دەهات.

چونکە ماوەی ڕێگاکەمان زۆر کەم مابوو بۆیە بەخێرایی چەند قسەیەکم پێی ووت، ووتم: باشە تۆ چۆن دەڕوانیتە خۆشەویستی (دڵداری) ووتم: برای خۆم هەر ئەوە بەسە کەتۆ تێبگەی کە خۆشەویستی حەرامە، ووتم:

ئایا ڕازی دەبیت کەسێك بەمەستی خوشك و ناموسی تۆ بەبەر دەرگاشتان دابێت؟

ووتی: نەخێر ووتم: کەوابوو ئەو کچەی تۆ دڵداری لەگەڵ دەکەیت خاوەنی باوك و براو کەس و کارە.

ووتم: ئایا بۆچی تۆ لەناو ئەو هەموو کچانە کچێك دەکەی بە خۆشەویستی خۆت، وە کچێك لەناو کۆمەڵێك کوڕ تاکە کوڕێك دەکات بە خۆشەویستی، لەسەر بنەمای هەڵبژاردنە وانیە؟ ووتی: بەڵێ ووتم: تۆ گرنتیت چی یە کە کچێکی جوانتر نابینیت و دڵت بۆی ناچێت؟ ئەو کچەش وەك تۆ ئەگەر کوڕێکی قۆزترو دەوڵەنترو دەسکراوەتر ببینێت وەك ئەوەی جەنابت ئەو هەڵدەبژێت.

هەر لەناو تەکسیەکە بەر لەوەی بێینە خوارەوە چەندین جاری تریش پێشتر دووبارەی دەکردەوەو دەی ووت: (واللە) مامۆستا دەستم لێی نابێتەوەو دڵم هەر لەسەریەتی؟

منیش ووتم: کوڕی خۆم بابە گیان تۆ هێشتا نەچویتە ناو ژیانی ژن ومێردایەتی و پرۆسەی هاوسەرگیری، ژن و مێردایەتی هەر تەنها زەوق و ئارەزووبازی نیە، ژن ومێردایەتی واتە ماڵ بەڕێوەبردن، و منداڵ بەخێوکردن، لێك دڵنیا بوون، ئایا تۆ لەو کچە دڵنیای

کەپەیوەندی لەگەلّ چەندین کەسی تر نیە، ئەمە یەکێکیان خودای گەورە بۆی ئاشـکرا کـردی سوپاسی خودای گەورە بکە کە هەر زوو بۆت دەرکەوت و ئاشکرابوو.

ووتم: ئایا ئەگەر تۆ ئەوکچە بهێنیت ئەو کوڕە خالّەی یا هەر خزمێکـی گـەنجی وەك ئـەو بێتە سەردانیتان دلّنیای کە بەمەبەستی خراپ نایەت بۆ مالّکەت!

خۆشەویستی و دلّداری لە ڕوانگەی ئایەت و فەرموودە پاك و بێگەردەکانی پێغەمبەر():

خودای گەورەو میهرەبان دەفەرمووێ: ﴿ وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ۚ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ ۚ فَانكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ مُحْصَنَاتٍ غَيْرَ مُسَافِحَاتٍ وَلَا مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ ۚ فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنكُمْ ۚ وَأَن تَصْبِرُوا خَيْرٌ لَّكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ {سورەتی نساء: ئایەتی٢٥} واتە: (ئەوەش کە نەیتوانی لەئێوە لەبەر دەست کورتی، ئافرەتانی سەربەستی باوەڕدار مارە بکات، ئەوە با لە کچە کەنیزەکە ئیماندارەکانتان بخوازێت، خوایش زانایە کەڕادەی ئیمانتان چەندە وچۆنە، ئێوە هەندێکتان لەهەندێکتانن (هەمووتان لە ئادەم و حەوان ئەم جیوازیە چینایەتیە شتێکی کاتیە)، لەبەر ئەوە ئەو کەنیزەکانە مارە بکەن لەسەر ڕەزامەندی کەس و کارو خاوەنەکانیان و مارەییان بەچاکی پێ بدەن، لەکاتێکدا ئەو کەنیزەکانەش پێویستە پاك داوێن بن و دوور بن لە داوێن پیسی **دۆست گرتنەوە**، خۆ ئەگەر شوویان کردو لەوەودوا داوێن پیسیەکیان ئەنجامدا ئەوە نیوەی سزای ئافرەتانی سەربەسات دەدرێن (چونکە ئازادی تەواویان نەبووە لەو سەردەمەدا) لەبەر ئەوە مارە کردنیان بۆ ئەوانەتان کە دەترسێت توشی هەڵەو گوناه بێت، خۆڕاگریتان (تاخوا دەرووتان لێدەکاتەوە) چاکترە بۆتان، خوایش لێخۆشبوو میهرەبانە).

﴿ ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ ۖ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِىٓ أَخْدَانٍ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾ {سورەتی المائدة: ئایەتی٥} واتە: (لەمڕۆوە هەرچی خۆراکی چاك وپاکە بۆتان حەڵاڵە کراوەو خواردنی ئەوانەی کتێبی ئاسمانیان پێدراوە بۆتان حەڵاڵە، خواردەمەنی ئێوەش حەڵاڵە بۆ ئەوان، ئافرەتانی داوێن پاك لە ئیمانداران و ئافرەتانی داوێن لەوانەی کتێبیان پێدراوە پێش ئێوە (بۆتان حەڵاڵە) کاتێك مارەییان پێ بدەن، بە مەرجێك ئێوە پاك داوێن بن‌و داوێن پیس نەبن بەئاشکراو دوورە پەرێز بن لەدۆست گرتنی نهێنی بۆ داوێن پیسی، جائەوەی بێ بڕوا بێت بە شەرعی خواو لەو حەرامانە خۆی نەپارێزێت، ئەوە ئیتر هەموو کارو کردەوە چاکەکانیشی پووچ دەبێتەوەو ئەو جۆری کەسانە لە قیامەتدا لەریزی خەسارەتمەندو زەرەرمەندو دۆڕاوەکاندان).

پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) دەفەرمووێ: ((لم یر للمتحابین مثل النکاح)) واتە: (هیچ چارەیەك بەباشتر نەبینراوە بۆ پیاوو ئافرەتێك کە یەکتریان خۆش دەوێت لە مارەبڕینیان لەیەکتر).

## بۆ چی دڵداری حەرامەو دروست نیە؟

١ـ پێچەوانەی فەرمانی خودای گەورەو پێغەمبەری سەروەرە.

٢ـ هۆکارێکە بۆ داوێن پیسی و بەد ڕەوشتی.

٣ـ سووك کردنی ناموسی خەڵکانە .

٤ـ هەموو کەسێکی بەغیرەت و بەشەرەف رازی نابێت کەپیاوان لەگەڵ کچ و خێزان و خوشکیان دڵداری بکەن.

٥ـ هۆکاری تێکچوونی شیرازەی کۆمەڵگایە.

٦ـ دەبێتە مایەی سوك کردنی بەهای کچ و ئافرەتانە.

*** شوێنەوارە خراپەکانی خۆشەویستی ـ دڵداری لە سەر تاك و کۆمەڵ:**

اـ متمانەو دڵنیابوون لەگەڵ یەك کەم و لاواز دەکات.

ب ـ مرۆڤ فێری چاوبازی دەکات و دواییش پێی تەرك ناکرێت.

ج ـ هۆکارێکە بۆ زیناو داوێن پیسی.

د ـ مرۆڤ گیرۆدەی وابەستە بوون دەکات بەیەك کەس، رێگای تری لەبەردەم دادەخرێت.

هـ ـ زۆر کەسی توشی وازهێنان کردووە لە هاوسەر گیری کردن، بەهۆی ئەوەی دڵی بەکەسێکەوە بووەو بۆی نەبووە.

وـ زۆر ژن وپیاو کەبەرێگای خۆشەویستی و دڵداری هاوسەرگیریان ئەنجامداوە متمانەیان بەیەك نیە، وا تێدەگەن دوای هاوسەرگیریش هەر دڵداری لەگەڵ کەسانی تر دەکەن.

زـ بەهۆی زۆر لێك نزیبوونەوە، یا بەهۆی بەڵێنی بۆ یەکتربوون هەندێ جار کوران کچان لەخشتە دەبەن رازیان دەکەن کەئێمە هەر بۆ یەکترین دواییش نزیك دەبێتەوە لێی و دەبێتە هۆی لەدەستدانی کچێنی و لەم کاتەشدا کورە متمانەی پێی نامینێت و، دەڵێت دەبێت لەگەڵ چەند کەسی تر کاری خراپی وای کرد بێت .

ح ـ هەندێ لەو ئافرەت و پیاوانەی یا کچ و کورانەی کەخۆیان دەسووتێنن یا خۆیان دەکوژن گیرۆدەی کارێکی لەم جۆرە یا توشی داوی دڵداری بوینە بەرگەی هیچ نەخێرو نەرێیەکی خۆشەویستەکەی و خزم و کەسەکانی ئەوو خزم و کەسانی خۆی و هیچ کەسێکی تر ناگرێت، بەهۆی لاوازی کەسایەتی و دڵ و دەروونی و بەرتەنگبوونی دونیا لەبەرچاوی پەنا بۆ ئەم کارەی خۆکوشتن دەبات.

ط ـ رسوابوون و شەرمەزاربوونی بنەماڵەو تیرەو عەشیرەتان بە هۆی کاری چەوتی گەنجانێکی نەزان و نەفام کە خۆشەویستی دڵداریە، زۆرجار بووەتە هۆی دوژمنکاری و پیاو کوشتن.

* ئایا خۆشەویستی و دڵداری پاك و ناپاکی هەیە؟

لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێم ئایا زینا داوێن پیسی پاك و ناپاکی هەیە؟

ئایا ئارەق خواردنەوە پاك و ناپاکی هەیە؟

ئایا زەلام کوشتن بەناحەق پاك و ناپاکی هەیە؟

کەوابوو حەرام حەرامەو پاك و ناپاکی نیەو هەمووی پیس و ناپاکە.

بۆ هەموو ئەو کەسانەی ڕێگا دەدەن و خۆشەویستی ودڵداری بە دروست و ڕەوا دەزانن و، پێیان نیشانەی پێشکەوتن و نوێخوازیە، ئایین و بریارە شەرعیەکان بەکوێرەی بۆچوون و ئارەزووبازی خەڵك هەڵدەسوڕێنن، پێیان دەڵێین ئەوە بریارو وەڵامی نوری چاومانە پێغەمبەری (ﷺ) سەبارەت بە دڵداری و ئەوەی بەهۆی دڵداریەوە دروست دەبێت:

ئەبی ئومامە(خودا لێی رازی بێت) دەفەرمووێ: گەنجێك هاتە خزمەت پێغەمبەری سەروەرو(ﷺ) ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕێگام پێ بدە با زینا داوێن پیسی بکەم خەڵکەکە سەرزەنشتیان کردو ووتیان: ئای ئای بێ دەنگ بە پێغەمبەری خودا فەرمووی: وەرە پێش نزیك بەوە، لێی نزیکبۆوەو دانیشت ئینجا پێی فەرموو: ئایا رازی دەبیت خەڵك لەگەڵ دایکت کارێکی وا بکەن ووتی:نا (واللە) خودای گەورە بەقوربانی تۆم بکات، فەرمووی: خەڵکیش رازی نابن بۆ دایکەکانیان، ئایا رازی دەبیت خەڵك لەگەڵ کچەکەت کاری وا بکات ووتی: نا(واللە) خودای گەورە بەقوربانی تۆم بکات فەرمووی: خەڵکیش ڕازی نابن بۆ کچەکانیان، ئایا رازی دەبیت خەڵك لەگەڵ خوشکت کارێکی وا بکەن ووتی:نا (واللە) خودای گەورە بەقوربانی تۆم بکات، فەرمووی: خەڵکیش رازی نابن بۆ خوشکەکانیان، دوایی پێغەمبەری بەسۆز دەستی پیرۆزی لەسەری داناو فەرمووی: ((اللهم اغفر ذنبه وطهر قلبه وحصن فرجه)) واتە: (ئەی خودایە لەگوناهەکانی خۆشبەو، دڵی پاك و خاوێن بکەوەو، داوێنی بپارێزە) دوای ئەم پاڕانەوەی خۆشەویست(ﷺ) بۆی ئەو گەنجە بەهیچ شێوەیەك سەیری ئافرەتانی نەدەکرد.

## بەرنامەیەكی تایبەت بۆئەو خوشكانەی كەلەو كانگە پیرۆزەدا لەبێ نوێژیدان رۆژووەوان:

١ـ خوشكی خۆم بزانە هەموو كاتێك گوێڕایەڵی كردنی پیاوەكەت و خزمەتكردنی ماڵ و منداڵەكەت عیبادەتە، بەتایبەت لەو مانگە پیرۆزەدا كەتۆ خزمەتی رۆژووەوانان دەكەیت.

٢ـ هەمیشە لەزیكری خودای گەورە بێ ئاگا مەبە.

٣ـ ئەو بەشە قورئانەی لەرۆژەكانی ئەو مانگە پیرۆزە دەیخوێنیت، دەتوانیت بەتەسجیل، یابەمۆبایل بەگوێ گرتن بیخوێنیت. چونكە گوێگری قورئان هەمان پاداشتی قورئان خوێنی بۆ دەنوسرێت.

٤ ـ زۆر بپاڕێوەو دوعا بكە.

٥ـ خوشكی گەورەم لەو چێشتەی لێی دەنێیت بەشی هەژارو نەدارو دراوسێیەكانتی لێ بدە.

## بڕیاری گۆڕانكاری بدە:

خوشكانی ئایین پەروەر: بزانن جێ بەجێ كردنی داواكاری پیاوو رەچاوكردنی ئارەزووی پیاوەكەت واجبێكی شەرعیەو، بەبێ پاساوی شەرعی بەهیچ شێوەیەك نابێت پشتگوێی بخەیت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێ: ((إذا دعا الرجل زوجته لحاجته فَلْتَأْتِه، وإن كانت على التَّنُّور)) {تیرمزی گێڕاویەتیەوە} واتە: (هەر كاتێ پیاو بانگی خێزانەكەی بكات بۆ پێویستی خۆی ـ مەبەست لێرە سەرجێی یە ـ پێوستە لەسەری بچێتە لای و وەڵامی بداتەوە ئەگەر لەسەر تەندوریش بێت).

لەفەرموودەیەكی تر پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێ: ((إذا دعا الرجل امرأته إلى فراشه فأبت أن تجيء فبات غضبان لعنتها الملائكة حتى تصبح)) {**بوخاری** گێڕاویەتیەوە} واتە: (هەر كاتێ پیاو بانگی خێزانەكەی بكات بۆسەر جێگای خۆی خێزانەكەی رازی نەبێت وەڵامی بداتەوە پیاوەكە لێی تووڕە بێت فریشتەكانی خودا نەفرەتی لێ دەكەن تابەیانی).

**بۆیە خوشکی بزانە:**

* پیاوەکەت هەر نەزەرێك یا هەر کارێکی نارەواو ناشەرعی بکات بەهۆی پێشێل کردنی مافیەوە لەلایەنی تۆوە، هەر هەموو گوناهەکانی دووچەندانە لەسەر تۆش دەنوسرێت.

# خەلاتی بیست و یەکەمین

# خۆت بگەینە ئاستی فریشتەکان

کۆتاییەکانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز ڕۆژانی زۆر پیرۆزو گەورەن مرۆڤ دەتوانێت لەو ڕۆژانە قەرەبووی هەموو ڕۆژو ساڵە بە فیڕۆ چووەکانی تەمەنی خۆی بکەوێت کە لە گوناهو تاوان و سەرپێچی بەرامبەر بە خودای گەورە بەسەری بردووە لە تاکە شەوێك خێرو پاداشتی هەشتاو سێ (٨٣) ساڵ بەدەست بێنێت.

**براو خوشکە بەڕێزەکان: فەرموون گوێ لەو بەسەرهاتە ڕاستەقینە بگرن:**

موسڵمانێکی دڵسۆز ووتی: شەوێك لە شەوەکانی کۆتایی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز لە ساڵەکانی نەوەدەکاندا لە مزگەوتێك لە مزگەوتەکانی هەولێر لەگەڵ کۆمەڵە گەنج و لاوێك لە ژوورێکدا کۆبووینەوە چونکە ژمارەمان کەم بوو، وە ساردیش بوو بۆیە هەر ئەو ژوورەمان گەرم کرد، ئینجا لە ئێوارەوە خەریکی نوێژو زیکرو قورئان خوێندن و عیبادەت بووین، تا درەنگانێکی شەو کاتی پارشێو دوو سێ کەسێکمان چووین سەمون بهێنین، بێگومان ئەو کات کارەبا نەبوو، بۆیە زۆر تاریکبوو کاتێ مزگەوتمان لێ بە دیارکەوت بینیمان شتێکی وەك دووکەڵ لەسەر مزگەوت بەرز دەبۆوە وامان زانی کە مزگەوت سووتاوە، بۆیە بە خێرایی هەڵەداوان خۆمان گەیاندەوە مزگەوت، بەڵام کە نزیك بووینەوە لە مزگەوت بۆمان دەرکەوت کە دووکەڵ نیە، بەڵکو نوورێکە زۆر بە جوانی بەستونی لەسەر مزگەوتەکە بەرز دەبۆوە بەرەو ئاسمان، زۆر دڵخۆش و کامەران بووین بەو بەخششە خوداییە، کە گەیشتینەوە ناو براماغان لە مزگەوت تا ئێستاش بە هیچیانمان نەووت، نەوەك توشی لەخۆباییبوون ببن.

بەڕاستی وەسف و گەورەیی ئەو شەوە تەنها خودای گەورەو میهرەبان توانیویەتی لە قورئانی پیرۆز بەدەری بخات و ڕوونی بکاتەوە، لە سورەتێکدا بەناوی سورەتی (القدر):

﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ﴿١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ ﴿٢﴾ لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ ﴿٣﴾ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ سَلَٰمٌ هِىَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ ﴾ {سورەتی القدر: ئایەتی ١ــ٥} واتە: (ئێمە بەڕاستی قورئانمان دابەزاندۆتە خوارەوە لەشەوێکی بەفەڕو ڕێزداردا * جا تۆ چووزانی شەوی بەفەڕ کامەیەو؟ چ خێرو بەرەکەتێکە * شەوی قەدری بەڕێز لەهەزار مانگ ڕێزدارو خێردارترە (واتە پاداشتی عیبادەت و خواپەرستی ئەو بێ سنوورە * لەو شەوەدا فریشتەکان کە جوبرەئیلیشیان لەگەڵدایە، دادەبەزن لەسەر ڕوخسەت و مۆڵەتی پەروەردگاریان، بەجۆرەها فرمان و کار( بەتایبەت بۆ سەردانی خواپەرستان، بۆ سەردانی مزگەوتەکان، بۆ گوێگرتن لەقورئان و...هتد * ئەو شەوە ئاسوودەیی و ئاشتی و هێمنی و ڕەحمەت و میهرەبانیە، هەتا کاتی بەرەبەیان).

* پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ڕۆژێك باسی پیاوێکی بەنی ئیسرائیلی کرد، بەڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو ،بە شەویش شەونوێژی دەکرد، دواییش هەزار مانگ لە غەزاو تێکۆشادا بوو، هاوەڵەکان سەیریان بەو پیاوە هات و، دڵتەنگ بوون بەوەی کە ئەوان تەمەنیان ئەوەندە درێژ نیە ئەو پاداشتەیان دەست کەوێت بۆیە خودای گەورە ڕاستەوخۆ ئەو سورەتەی دابەزاند.

* شەوێکی ئەو تۆیە نەوەك هەر تەنها موسڵمان ئەو پاداشتە بەدەست دێنێت، بەڵکو موسڵمان دەگەیەنێتە پلەو ئاستی فریشتە پاك و بێگەردەکانی خودای گەورە.

* زیندوو کردنەوەی ئەو شەوە هەموو گوناهەکانی پێشوو دەسڕێتەوە:((من قام ليلة القدر إيمانا وإحتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه)) {بوخاری گێراویەتیەوە} واتە: (ئەوەی شەوی قەدر زیندوو بکاتەوە بە بڕوایەکی تەواوو بە ئومێدی پاداشتی ڕۆژی دوایی خودای گەورە لەهەموو گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت).

* کاتی وەڵامدانەوەی پاڕانەوەکانە: پیاوچاکانی پێشوو پاڕانەوەیان لەهەموو عیبادەتێك پێ باشترو گەورەتربوو لەو شەوەدا، چونکە لەو شەوەدا فریشتەکانی خودا ئامین لەسەر دوعای موسڵمانان دەکەن.

* پێغەمبەری خودا(ﷺ) چۆن بووەو چی کردووە لەو شەوانە: خاتوو عائیشەی دایکمان (خودا لێی رازی بێت) دەفەرموویێت: ((كان رسول الله (ﷺ) إذا دخل العشر الأواخر أحيا ليله وأيقظ أهله وشد المئزر)) واتە: (پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ دە شەوەکەی کۆتایی ڕەمەزان دەهات شەوەکانی زیندوو دەکردەوەو، خێزانەکانی بە ئاگا دەهێناو، لە خێزانەکانی بەدوور دەکەوت لە خێزانەکانی ـ مەبەستی سەر جێی لەگەڵ نەدەکردن)

## بۆچی لەم شەوەدا بەئاگا بین و خودا پەرستی بکەین:

١ـ شەوی قەدر شەوی شاخەڵاتی خودای گەورە بۆ بەرەی ئادەمی زاد کە قورئانی پیرۆزە، کەوا بەئاگابەو خودا بپەرستە وەك سوپاسگوزاریەك بۆ خودای گەورەو میهرەبان.

٢ـ شەوی قەدر واتە شەوی بەرێزو پایەدار، کەوابوو بێ ئاگا مەبەو لە شوێنە ڕێزدارەکان بەو خوداپەرستی بکە تا بەرێزو پایەداربی.

٣ـ شەوی قەدر واتە ئەو شەوەی هەرچی ڕوودەدات و بەسەرت دادێت لەو ساڵەی دادێت لەو شەوەدا بڕیاری لەسەر دەدرێت، کەوابوو بێ ئاگا مەبە و خودا بپەرستە، تا شتی چاك و باشت بۆ بنوسرێت و بەباشی ببینرێیت.

٤ـ شەوی قەدر شەوی گەیشتنە بەکاروانی فریشتە پاك و بێگەردەکانی خودای گەورەو، پێغەمبەران و پیاوچاکان کەوابوو بێ ئاگا مەبەو دوا مەکەوە.

٥ـ شەوی قەدر شەوی قەربوو کردنەوەی تەمەنی بەبا ڕۆیشتووی ئەو کەسانەیە کە بێ ئاگاو مەستن بووینە تا ئێستا، بۆیە بێ ئاگا مەبەو ووشیاربە.

* چۆن ئەو شەوە پیرۆزە زیندوو بکەینەوەو خۆمان نیشانی خودای گەورە بدەین:

اـ چاکترین کردەوە لەو شەوەدا نوێژ کردنە، بەڵام ووریابە با نوێژەکەت وەك نوێژەکانی کاتەکانی تر نەبێ، بەڵکو نوێژێك بکە پڕ بەدڵ بێت و مل کەچ بە بەرامبەر بەخودای گەورە.

ب ـ زۆر بپاڕێیەوە لەخودای گەورەو میهرەبان هەر کێشەو کێرو گرفتێکت هەیە لەو بیخە بەر دەستی خودای گەورە چونکە ئەو شەوە شەوی بریاردانە لە سەر ئەو شتانەی بەسەرت دێت، ئومێد وایە خودای گەورە شتە ناخۆش و کێشەو گرفتەکانت بۆ بگۆڕێت بە شتی باش و چاك.

ج ـ شەوی دابەزینی قورئانی پیرۆزە بۆیە بیخوێنەوە، لێی ووردبەوەو بیری لیّ بکەوە بە تەواوی بیخوێنەوە وەك خودای داوای لێکردووین: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴾ {سورەتی البقرة: ئایەتی ١٢١} واتە:(دەستەیەك لەوانەی کتێبمان پێبەخشیون (قورئان) بەچاکی و بە ووردی دەور دەکەنەوە، ئەوانە باوەڕیان پێی هەیەو باوەڕی پیّ دەهێنن بەڵام ئەوەی بڕوای پێی نەبێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە لە خەسارەتمەندو زەرەرمەندەکانن).

د ـ شەوی بە خۆ داچوونەوەو بیرکردنەوەیە لە تەمەنی ڕابردوو، نەخشە کێشان و بڕیاردانە بۆ ڕۆژانی داهاتوو.

هـ ـ لەوشەوەدا زۆر کڕنۆش ببەو خۆت نزیك بکەوە لەخودای گەورە.

لەم شەوە بڕیاری گۆڕانکاری بدە:

* ئەگەر جگەرە کێشی وازی لێبینی.

*ئەگەر تا ئێستا قورئانت خەتم نەکردووە بڕیار بدە خەتمی بکەی.

*ئەگەر نێوانت لەگەڵ هەر کەسێك نیەو خراپە بڕیار بدە هەر لەو شەوە لەگەڵ چاك ببەوە دەزانی بۆ؟ چونکە خودای گەورە هەرگیز لە دوو کەسانێك خۆش نابێت و کردەوەکانیان لیّ وەرناگرێت کە نێوانیان نیە.

*ئەگەر تا ئێستا سەیری ئافرەتانی نامەحرەم ـ نەزەر ـ دەکەی و بە دوای ناموسی خەڵکەوەی، وازی لیّ بهێنە.

* ئەگەر تا ئێستا دڵى دايك و باوكت رەنجانداوە داواى لێخۆشبوون لە خوداى گەورە بكەو، دەستيان ماچ بكەو چاكەيان لەگەڵدا بكە.

* خوشكى بەرێزم ئەگەر تا ئێستا جل و بەرگەكەت ناشەرعى و بە كوێرەى فەرمانى خوداو پێغەمبەرەكەى نيە، بيرێك لە خۆت بكەوە.

* ئەگەر تاوەكو ئێستا كارو پيشەكەت بەدڵسۆزى و رێك و پێكى نەكردووە بزانە خوداى گەورە پرسيارت لىٚ دەكاتەوە.

**بەرنامەى رۆژووەوان: كاتى نوێژى (عەسر) :**

١ـ بەر لە نوێژەكە بە (١٠ـ١٥) خولەكێك لەمزگەوت ئامادەبە.

٢ـ دوو ركات سوونەتى(چوونەناو مزگەوت) بكە.

٣ـ تا كاتى نوێژ خەريكى چەند زيكرێك يابرێك قورئان بخوێنە.

٤ـ ئينجا كە بانگدرا وەڵامى بانگەكە بدەرەوەو، دوعاى وەسيلە بخوێنە.

٥ـ چوار ركات نوێژى سوونەتى پيش نوێژى (عەسر) بكە.

٦ـ زيكرەكانى دواى نوێژەكە بكە.

٧ـ بەشدارى ووتارى پاش (عەسر) بزانە ئەوە بەكۆرى زيكر بۆت دەنوسرێت.

بريارى گۆرانكارى بدە: بەراووردێك بكە لەنێوان هەوڵ و تێكۆشانت بۆ دونياو، هەوڵ و تێكۆشانت بۆ دوا رۆژت، بزانە بۆ كاميان ماندووترى كاميانت زياتر لەبيرە، لەكاميان زياتر دەمينێيتەوەو ئينجا بەئەندازەى مانەوەت تێيدا هەوڵ و كۆششى بۆبكە.

(سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا الله أستغفرك وأتوب إليك)

# خەلاتی بیست و دووەمین

## لەماڵی پێغەمبەر(ﷺ) رەخنە دەبێتە خەندە

موسوڵمانانی بەڕێز: دیارە ئەو دونیایەی ئێمە تێیدا دەژین هۆڵێکی گەورەیە بۆ تاقیکردنەوەی ئێمەی مرۆڤ وا مەزانە لەو دونیایە کەسێك هەبێت بێ کێشەو گرفت و ناخۆشی بێت ئەگەر ئەو کەسە پێغەمبەری خودای گەورەش بێت، یا دەوڵەندترین کەسی سەر رووی زەوی بێت، نەخێر هەموو مرۆڤێك کێشەو گرفتێکی هەیە، ئینجا یا من تۆ هەستی پێدەکەین و دەیزانین یا شاراوەو نادیارەو لەناخی ئەو کەسەدایە کەتۆ پێت وایە وەك فریشتە بێ گرفت وکێشەو ناخۆشیە، کەوابوو وەك خۆی لەو دونیایە تێبگەو بژی نەوەك کەسێکی نموونەیی لەو دونیایە تێبگەیی و بژی وابزانی و واتێبگەی کە هەرگیز نابێت کێشەو گرفتت هەبێت.

کەوابوو ئەو دونیایە یەکسانە بە کێشەو گرفت و ناخۆشی و نەخۆشی، بەڵام ئەوەی لەسەر مرۆڤە خۆپاراستنە لەو کێشانە تا لە توانای دایە کەنەیەت و بەسەری نەیەت، بەڵام کە کێشە رووی داو هات، پێویستە مرۆڤ پێشوازی لێ بکات و ڕووبەڕووی بێتەوە بەوەی کە هەڵسوکەوتی گونجاوی لەگەڵدا بکات.

فەرموون بابەیەکەوە سەفەرێکی رووحی بکەین بەرەو شاری مەدینەی پیرۆز بچین لەوێش بچینە ماڵی سەروەرو خۆشەویستمان(ﷺ) ئەوە ماڵی پێغەمبەری خودایە(ﷺ) کێشەو گرفتی خێزانی لەماڵی پێغەمبەری خودای وەك هەر ماڵ و خێزانێکی ئاسایی پێغەمبەری سەرداریش(ﷺ) کێشەی لەگەڵ یەکێ لەخێزانەکانی هەیە، ئەو خێزانەش خاتوو عائیشەیە(خودا لێی رازی بێت) رۆژێکیان پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) لەگەڵ خاتوو عائیشەی خێزانی لەماڵە خنجیلانەکەی خۆی دانیشتووە کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەگەڵ عائیشە لەسەر شتێك ناگەن بەیەك و واتە کێشەیەکیان دەکەوێتە نێوان، لەم کاتەدا پێشەوا گەورەمان ئەبوبەکر (خودا لێی رازی بێت) کەباوکی خاتوو عائیشەو خەزوری پێغەمبەری خۆشەویستە(ﷺ) پێغەمبەری خودا لەوکاتەدا روو لە خاتوو عائیشەی خێزانی دەکات و

دەفەرمووێ : ئەی عائیشە ئەوە ئەبوبەکری باوکتە خۆ رازی ئەو ببێتە ناو بژیوان لە نێوانمان خاتوو عائیشە ووتی: بەڵێ رازیم پێغەمبەری خودا فەرموی: فەرموو تۆ سکالاَی خۆت بکە؟ خاتوو ووتی: نا تۆ بڵێ (ئینجا خاتوو عائیشە پەنجەی بەرز کردەوەو ووتی: بەڵام ڕاست بڵێی؟! کاتێ پێشەوا ئەبوبەکر ئەم هەڵسوکەوتەی خاتوو عائیشەی بینی ئەو قسەیەی لێ بیست تووڕەبوو ڕەنگی سوور بۆوەو زۆر بەتوندی بەرەو خاتوو عائیشە چوو تا لێی بدات بەڵام لەم کاتەدا خاتوو عائیشە خۆی لەپەنای پێغەمبەری خۆشەویست حەشاردابوو، پێغەمبەری سەردار(ﷺ) بەرگری لە خاتوو عائیشە دەکردو بەپێشەوا ئەبو بەکری دەفەرموو: خۆ ئێمە ووتمان ببە ناوبژیوان نەمان ووت لێمان بدە.

موسڵمانان و ڕۆژووەوانانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز: فەرموو بەراووردێك بكە لەنێوان ماڵی پیرۆزی پێغەمبەری خوداو(ﷺ) ماڵەکەی خۆت لەم خاڵانەی خوارەوە:

* کێشەکەی ماڵی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چەندی خایاندو ئەی ئەو کێشانەی لەماڵەکەی تۆ ڕوودەدات چەند دەخایەنێت؟

* بەرگری پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) لەخاتوو عائیشەی خێزانی و ئایا بەرێزیشت بەرگری لەخێزانەکەت دەکەیت؟

*پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) کەم و کورتیەکانی خێزانەکەی بۆ پێشەوا ئەبوبەکری خەزووری باس نەکردو داپۆشی، ئایا تۆش لەکاتی کێشەکانت کەم و کورتی خێزانەکەت دادەپۆشیت؟

* ژن و مێردی بەرێز ئایا تۆش وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەوڵدەدەیت کێشەکانت بچوك بکەیتەوە؟

* خەزوورانی بەقەدرو بەرێز: ئایا کێشەکانی کچەکەت و زاواکەت چۆن چارەسەر دەکەیت و؟ کەی تووڕە دەبیت؟

خوشك و براکانم: کێشە زەق و ڕووالەتیەکانی نێوان زۆربەی خێزانەکانی ئێستا ئەمانەن:

١ـ دامەزراندنی هاوسەرگیری لەسەر بنچینەو بنەمای خۆشەویستی و دڵداری.

٢ـ دانەنانی بناغەو بنچینەیەکی تۆکمەو دامەزراو لەسەرەتای دەسپێکردنی ژیانی هاوسەریەوە،وەك هەڵبژاردنی یەکتر، مارەبڕین و مارەیی، گواستنەوەو شەوی بوك و زاوایەتی‌و هەفتەکان و مانگەکانی سەرەتای ژن و مێردایەتی.

٣ـ نەبوونی متمانەو دلّنیایی لەنێوان ژن و مێرد، بەدواداچوونی یەکتر.

٤ـ ڕەچاو نەکردنی شێوەو شێوازی ژن و مێردایەتی و سەر جێی کردن لەنێوان ژن و مێرد.

٥ـ گرنگی نەدانی ژن بەپیاوەکەی و پیاو بەژنەکەی لەبواری خۆڕازاندنەوەو، گفتوگۆو، هەلّسوکەوت بەگشتی.

٦ـ نەخوێندنەوەو لێك تێنەگەیشتنی یەکتر.

٧ـ کێشەی خەسوو خەزووری یەکترو، خزم و کەسانی یەکتر.

٨ـ کێشەی جادوو سیحرو فێلّ لەیەك کردن.

٩ـ داواکاری زۆرو یاداوای شتی گران و زەحمەت لەیەکتر کردن.

١٠ـ کێشەی دووژن و زیاتر لەگەلّ خێزان و خاتوونی یەکەم.

ئەم چەند خالّەی سەرەوە کە ئاماژەمان پێی کرد بۆ ئێوەی ژن و مێردی گەنج و لاوی بەڕێز وەك دلّسۆزی و دلّسوتاویەکمان بۆ ئێوەی براو خوشکی ئیماندارو موسلّمان بەو هیوایەی ببێتە مەرهەمێك بۆ سارێژ کردنی ئێش و ئازارو کێشەکانتان، ئەم خالاّنە چەند دیاردەو ڕوالّەتێکی باوو بلاّوە لەو کێشەوگرفتانەی نێوان زۆربەی ژن و مێردانی ئەو سەردەمەی ئێستا.

براوخوشکی ئایین پەروەر: هەروا جێت ناهێلّم کێشەکانت بخەمە بەرچاوو، دوایش بێ چارەسەرو دەرمان وازت لێ بهێنم نەخێر فەرموو لەگەلّمبە، ئەگەر مالّ و خێزانی بەختەوەرو کامەرانت دەوێت، هۆکارەکانیشی بزانە تا خۆتی لێ بپارێزیت:

## هۆکارەکانی درستبوون و سەرچاوەی ئەو گرفت و کێشانە:

١ـ ژن و مێردە گەنج لاوانەی کەهاوسەرگیریان لەسەر بنەماو بنچینەی دلّداری و خۆشەویستی دامەزراندووە، بەهۆی دەق گرتنیانەوە بەو کارە هەر لەتەمەنی لاویەتیانەوە بۆیە هەندێ جار ناتوانن بەسەر ئارەزووەکانیانەوە توشی دلّپیسی و دوودلّی بوون دەبن لەیەکترو متمانەیان بەیەکتر نامینێت و، لە کۆتاییشدا توشی کێشەو گرفت دەبن.

٢ـ خەلّکانێکی زۆر کاتێ پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجام دەدەن هیچ بنەماو بنچینەیەکیان نیە، هەندێکیان لەگەلّ ئەوەی خوێندەوارو خاوەن بڕوانامەن بەلاّم هیچ کتێبێك ناخوێننەوەو

خۆیان ڕۆشەنبیر ناکەن سەبارەت بەو بابەتە گرنگ و پێویستە، ناچێتە لای کەسانی شـارەزاو پسپۆر بۆ پرس و ڕا پێکردن و خۆ شارەزا کردن، خۆیان بەموسڵمان و ئوممەتی سەروەر دەزانـن بەڵام لەو کارو پرۆسە گرنگە چاو لەو پێغەمبەرە خۆشەویستە ناکەن.

٣ـ دڵپیسی و دڵنیایی نەبوونی ژن و پیاو لەیەکترو چاودێری کردنـی یـەکتر لـەژوورەوەو دەرەوەو هەڵسوکەوتەکانی یەکتر، ئەمەش دەبێتە هۆی ئـەوەی ژیانیـان ناڕەحـەت و نـاخۆش بێت، شتی زۆر بچوك و کەم لەیەکتر گەورە دەکەن، گومان لە هەموو شتێکی یەکتر دەکەن.

٤ـ گرنگی دانی ژن و مێرد بە ئارەزووی یەکترو کە بەشێکی ئامانج لە هاوسەرگیری ئەو بابەتەیە، هەندێ لەژن و پیاوان لەم بوارو بابەتـە یـەکتر فـەرامۆش دەکـەن، بـەهۆی هەنـدێ پاساوو بیانوی بێ بنەماو بنچینە، ئەمەش زۆر جار دەبێتە هـۆی کیـشەوگرفت لـەدونیاداو، مایەی خەشم و توڕەیی خودای گەورە لەدواڕۆژ.

٥ـ گرنگی نەدانی ژن و مێرد بەیـەکترو ڕانـەگرتنی دڵـی یـەکتر، گرنگـی نـەدان حـەزو ئارەزووی یەکترو، گرفت و کێشە دروست دەکات.

٦ـ ژن پیاو هەر لەشەوی یەکەم چەندو هەفتەو مانگەکی سـەرەتای هاوسـەرگیریان دیـار بکەن بۆ یەکتر خوێندنەوەو شارەزابوون، بەڵێن بەیەکتر بدەن تا ئەوەندە مانگە چاوپۆشـی لـە کەم ویەکتر بکەن، هەڵەو کەم و کورتی یـەکتریان زۆر لائاسـایی بێـت تـا بەتـەواوی لەیـەك شارەزا دەبن، هەر یەکەو باسی ئەو شتانە بکەن کەحەزی لێ دەکات،هـەروەها ئـەو شـتانەی کەحەزی لێ ناکەن و بەدڵیان نیە بۆ یەکتر باس بکەن و ڕوون بکەنەوە.

٧ـ خەسوو خەزوورو خزم و کەسانی ژن و مێرد هەندێ جار دەبنە هۆکاری کێشەو گرفت، بۆ ئەم بابەتەش هەر یەکێ لە ژن و پیاوەکە هەستی بەساردی ئەوی تر کرد بەرامبەر بەباوكو دایك و خزم و کەسەکانی، با هەوڵبدات بەچاکترین ونایابترین شێوە هەڵسوکەوت بکات لەگەڵ دایك و باوك و خزم و کەسـەکانی ئـەوی بەرامبـەری تـا هەسـتی بجولێنێـت و بـەبێ قـسەو دەمەقاڵە چاکی بکاتەوە.

٨ـ براو خوشکی موسلْمان و ئایین پەروەر: هەندێ لەژن و پیاوان کاتێ تووشی کێشەی خێزانی دەبنەوە بەتایبەت خوشکانی بەرێز هەموو رێگایەکی شەرعی و ناشەرعی دەگرنە بەر بۆچارەسەر کردنی کێشەو گرفتەکانیان، یەکێ لەو رێگایانەش سیحرو جادووە، کەبە چەندەها دەقی ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) حەرامەو دروست نیە، ئەگەر یەکێکیانیش بزانێت ئەوەی بەرامبەر کراوە پێی ناخۆش دەبێت و متمانەی پێی نامێنێت.

٩ـ هاوکاری یەکتر کردنی ژن و پیاو لەماڵەوە خۆشەویست و تەبایی لەنێوان خێزانەکان زیاتردەکات، بە پێچەوانەوەش داواکاری زۆرو شتی زەحمەت و بار گران کردنی یەکتر دەبێتە هۆی دەمەقاڵەو کێشە، بەلەرووی دارایی هەندێ ئافرەت خەرجی زیاد لەپێویست دەکەن رەچاوی باری دارایی ناکات، یا هەندێ پیاو بۆهەموو شتێکی داوا لە ژنەکەی دەکات هەرگیز بۆخۆی بچوکترین شت ئەنجام نادات، بەتایبەت لەوکاتانەی کە خێزانەکەی باری تەندروستی ناتەواوەو نادروستە رەچاوی ناکات.

١٠ـ کێشەی هێنانی ژنی دووەم مەبەستمان ئەو پیاوانە نیە کەخاوەنی دووژنن، بەڵکو ئەوانەی کەیەك تاکە خێزانیان هەیە، بەڵام بێ ئەوەی هیچ شتێك لەئارا دابێت زۆر باسی ئەو بابەتە دەکات و سەروو دڵی خێزانەکەی نا رەحەت دەکات و کێشە بۆ خۆی دروست دەکات.

## * هۆکارە چارەسەریە پارێزەرەکانی ناو ماڵی موسلْمان:

ا- جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خودای گەورە، وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا۟ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَٰفًا خَافُوا۟ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْيَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴾{سورةتى النساء، ئايةتى٩} واتە: (دەبا ئەوانەش کە (دوور نیە بەم نزیکانە بمرن) و ئەوەی لاوازو ساوایان لەدوا بەجێ بمێنێت، خواناسی و ئایینداری بکەنە پیشەیان و گوفتاری چاك و بەجێ بڵێن (وەسیەت بکەن، بێگومان خوا دەمێنێت بۆ منداڵی جێماویان ئەگەر خواناس و گوفتار جوان و بەخشندە بن).

پێغەمبەری خوای گەورەش دەفەرموویت: ((إحفظ الله يحفظك)) واتە: (فەرمانەکانی خودای گەورە جێ بەجێ بکە خودای گەور دەتپارێزێت).

ب ـ خۆشارەزا کردن لەشێوەو شێوازی بەرێوەبردن و هەلّسوکەوت کردنی ژن و پیاو لەگەلّ یەك کردن، سوود بینین لە ژیاننامەی سەروەرمان(ﷺ).

ج ـ زۆر خوێندنی سورەتی (البقره)، زوو زوو ناوەناوە بەدەنگێکی نەرم و خۆش بەمۆبایل یا تەسجیل یا هەر ئامێرێکی تر بخوێندرێت، مەرج نیە بەخودی بیخوێنێت، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرمووێ: ((إن الشيطان يفر من البيت الذي تقرأ فيه سورة البقرة)) واتە: (شەیتان هەلّدێت و رادەکات لەو مالّەی کە سورەتی (بەقەرەی) تێدا بخوێندرێت)

د ـ دوعاو پارانەوەو پەنا بردنە بەر خودای میهرەبان بۆ چارەسەر کردنی گرفتە خێزانیەکان، پێغەمبەری سەردار(ﷺ) دەفەرمووێ: (دوعاو پارانەوە بەلاّو ناخۆشی لادەبات و بەرز دەکاتەوە)

هـ ـ پەنا بردنەبەر کەسانی خواناس و شارەزا بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان.

و ـ ئامۆژگاری بەردەوام و بێ هیوا نەبوون لە ئامۆژگاری کردنی هەر یەکێك لەژن و پیاو بۆ یەکتر.

ز ـ سکالاّ کردن لای کەسێکی هێمن و تێگەیشتووی خەزوورانت، بۆ هاوکاری کردن و یارمەتی دانت.

*** پەیرەو کردنی فەرمانی خودای گەورە کەدەفەرموویت:**

﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴾ {سورەتی **النساء**: ئایەتی٣٥} واتە: (خۆ ئەگەر ترسان نێوان ژن و مێرد بشێوێت و (کێشەیان چارەسەر نەکرێت) دادوەرێك لەخزمی پیاوەکەو دادوەرێك لەخزمی ژنەکە بنێرن (بۆ رێکخستنیان) ئەگەر چاکسازی و رێکخستنیان

بوێت، ئەوە خـوا پێکهـاتن فەراهـەم دەهێنێـت لـەنێوان ژن و مێردەکـەدا، بێگومـان خـوا هەمیشەو بەردەوام زاناو ئاگایە).

# خەلاتی بیست و سێیەمین

## پارێزگاری ناموسی خێزانەکەت لەسەر تۆی پیاوە

خوشك و برای ڕۆژووەوان لەو مانگە پیرۆزو پڕ لە خێرەدا بیر بکەوە لەو هەموو کێشە کۆمەڵایەتیانەی ڕووبە ڕووی خێزان و خانەوادەی موسڵمانان دەبێتەوە لەو سەردەمەی ئێستا سەبارەت بەخێزان و کچ و کوڕەکانت، بۆ چارەسەری ئەم جۆرە کێشەو گرفتانە، بەرچاوت تاریك نەبێت و شەرعی خوداو سوونەتی پێغەمبەری نازدارت لەبیر نەچێت ، بزانە ئەگەر هەموو خەڵکان دەرگاکانیان بەڕووت داخەن بزانە ئاسمان و خوداو پێغەمبەرەکەی هەرگیز داناخرێت هەردەم کراوەیە، زوو بڕیاری خۆت مەدەو قسەی خۆت مەسەپێنە چونکە ڕۆژێك دێت پەشیمان دەبیتەوەو پەشیمانیەکەشت دادت نادات.

بەر لەوەی بۆچارەسەری ئەم جۆرە کێشانە بچینە خزمەت پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) فەرموون لەگەڵ ئەم بەسەر هاتە ڕاستەقینەیە، تا بزانن زوو بڕیاردان و نەشارەزایی لە ئاین چ کارەساتێکی بەسەر مرۆڤ دەهێنێت لە دونیاو دوارۆژ:

کچێکی گەنج و تازە پێگەیشتوو بەشەرم و شکۆو دوور لەهەموو تاوان و خراپەیەك، تووشی نەخۆشیەك دەبێت دایکی داوا لەبراکەی دەکات کەئۆتۆمبێلەکەی بیانبات بۆ لای پزیشك، وای ئەوەی دەچنە لای پزیشك و پزیشك پکنینی بۆ دەکات چەند پشکنینێکی تاقیگەیی بۆ دەنوسێت دایك و کوڕەکە دەیبەن بۆتاقیگەیەك و پشکنینەکانی بۆ ئەنجام دەدەن، دوای دوای ماوەیەك ئەنجامی پشکنینەکان دەردەچێت پزیشکی تاقیگەکە کاغەزی پشکنینەکە دەبات بۆ لای دایکی کچەکەو پێی دەڵێت: ئەم نەخۆشە چی تۆیە؟

دەڵێت: کچمە.

دەڵێت: موژگێنیت لێ بێت کچەکەت دووگیانە!

لەم کاتەدا دایکەکە دەحەپەسێت و بێ سێ و دوو بانگی کوڕەکەی دەکات و پێی دەڵێت: ئەم پزیشکە دەڵێت خوشکەکەت دووگیانە ئەگەر پیاویت و غیرەتت هەیە با نەی بەینەوە بۆ

ماڵەوەو لەشوێنێك لە کۆڵە خۆمانی دەکەینەوە، بەڵام ئەم کچە داماوو بێ تاوانە ئاگاداری چرپە چرپی نێوان دایك و براکەی نیەو نازانێت چی ڕووی داوەو چی بووە! بۆیە دایکی بانگی دەکات و پێی دەڵێت هەستە با بڕۆین. هەرسێکیان سەری ئۆتۆمبێلەکە دەکەون و بەڕێ دەکەون بەڵام کوڕەکە ئاگری لە نێوچاوان دەباری کچەکە کاتێکی زانی ئاڕاستەی ڕۆیشتنی ئۆتۆمبێلەکە بەرەو ماڵەوەیان نیەو، بەرەو شوێنێکی چۆل دەڕوات پرسیار لەدایکی دەکات دەڵێت: دایە گیان دەچینە کوێ؟ ئەویش زۆر بە توڕەییەوە وەڵامی دەداتەوەو: دەڵێت تۆ دەزانی . کاتێ کچە ئەو قسەیەی دایکی دەبیستی سەری سوور دەمینێ دەزانێت شتێکی ناخۆش چاوەڕوانی دەکات، لەوکاتەدا براکەشی ئاوڕی لێ دەداتەوەو پێی دەڵێت: ووس بە هیچ قسەیەك نەکەی بێ ئابڕووی بێ شەرم، تۆ سەری خانەوادەو عەشیرەتەکەمانت شۆڕ کردووە. کاتێ دەگەن بەشوێنێکی دوور لەئاوەدانی و خەڵك کچەی داماو دەهێننە خوار دوای چەندین قسەی ناشیرین ناخۆش و پاڕانەوەیەکی زۆری ئەو کچە دەست و قاچ ماچ کردنی براو دایکەکەی بەڵام ئەو دایك وکوڕە سوور دەبن لەسەر کوشتنی و براکەی دەمانچەکەی دەردەهێنێت و دەیداتی بەر کوللە . کاتێ دەیانەوێت بۆ ماڵ بگەڕێنەوە کوڕەکە داوای کاغەزو پلیتی پشکنینەکە لەدایکی دەکات تا بەباوك و براکانی تری نیشان بدات بۆچی کوشتوویەتی کاتێ سەیری کاغەزەکە دەکات دەبینێت کاغەزەکە ناوی ئافرەتێکی تری لەسەر نوسراوەو بەهەڵە ئەو کاغەزە بەوان دراوە.

ئەمە کەسانی دوور لەخواو نەشارەزا لەئایین: دەفەرموون بایەکەوە بچینە خزمەت پێغەمبەرێ خۆشەویست (ﷺ) سەبارەت بەتۆمەت خستنە پاڵ یەکێ لەخێزانەکانی:

ئەمە ئەو بەسەرهات و ڕووداوێك بوو کە ڕووبەڕووی پێغەمبەری خۆشەویست و یەکێ لە خێزانە هەرە بەڕێزو خۆشەویستەکانی بۆوە تا ئێستاش خەڵکانێکی هاوبیرو هاوشێوەی (عەبوللا)ی کوڕی (ئوبەی) دووڕوو دڵپیس، قسەی ناشیاوو دەکەن و تۆمەتی خراپەکاری دەدەنە پاڵ خاتوو (عائیشە)ی بەپاك دانراو وەك خودای گەورە لەبارەیەوە لەسورەتی (النور) دەفەرمووێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ۚ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم ۖ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ ۚ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ ﴿١٢﴾ لَّوْلَا جَآءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ ۚ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا۟ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِى مَآ أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾ إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ وَلَوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبْحَٰنَكَ هَٰذَا بُهْتَٰنٌ عَظِيمٌ ﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُوا۟ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٠﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۚ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢١﴾ وَلَا يَأْتَلِ أُو۟لُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُو۟لِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْغَٰفِلَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ لُعِنُوا۟ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ {سورەتی النور:١١ـ٢٣}

## بە کورت و پوختی هەندێ لە رێنماییەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەخەینە بەردەستی ئێوەی بەرێز :

١ـ ئەو کەسانەی سوکایەتی بە ناموسی خەلکان دەکەن بارێکی زۆر گرانیان دەکەوێتە سەر لە گوناهو تاوان .

٢ـ پێویستە موسڵمان گومانی چاکی بە برا و خوشکی موسڵمانی خۆی هەبێ.

٣ـ بۆ سەلماندنی کاری بەدرەوشتی و داوێن پیسی پێویستە چوار شایەد هەبێ.

٤ـ لەکەدار کردنی کەسایەتی مرۆڤ لای خودای گەورە شتێکی زۆر گەورەیە.

## بەرنامەی رۆژووەوان بۆبەربانگ کردنەوەوە:

١ـ باشترین خواردن کەبەربانگی پیّ بکەیتەوە خورمایە، ئەگەر خورما نەبوو ئینجا ئاو .

٢ـ بۆ ئەوەی زۆر نەخۆیت وا چاکە بەدوو جار ناکە بخۆیت، بەربانگ لەمزگەوت بکەیتەوە دوایی لەماڵ برێك خواردن بخۆیت.

٣ـ برێکی زۆر کەم خواردن بخۆ تا بۆ نوێژی (عیشا) و (تەراویح) لاشەت سووك و خۆش بێت.

٤ـ واچاکە خواردنەکەت لەسیّ جورە خواردن زیاتر نەبێت.

٥ـ زیادە رۆیی نەکردن لەخواردن و خواردنەوە.

بریاری گۆرانکاری بدە:

ئەگەر تائێستا ماڵگرو چرووك بووی لەمەودوا بەخشندە بەو ماڵەکەت لەرێگای خودا ببەخشە.

# خەلاتی بیست و چوارەمین

## ئایا دەزانی ئەمانەتی هەرە گەورە چی یە؟

رۆژێك ئەبو هورەیرە دوای ماوەیەك لە کۆچی پێغەمبەری سەردار(ﷺ) دەچێتە بازاری مەدینەی پیرۆز بەڵام کاتێ دەچێتە بۆ جێ بەجێ ئیش و کارەکەی، گەرم و گوڕی و سەرقالیەکی زۆرو بێ ئەندازە دەبینێت لەم موسڵمانانەی ناو بازاڕەکەو، بۆیە بیر دەکاتەوە بە چ شێوەو شێوازێك ئەو موسڵمانانە بێنێتەوە سەر خۆیان و، چۆن ئاگاداریان بکاتەوە لەوەی کە ئەوان سەردەمانێکی زوو، پێش ئێستا لە سەردەمی زێرینی پێغەمبەری ئەکرەمدا(ﷺ) وا نەبوون و پێغەمبەری خواش بەم شێوە پەروەردەی ئەو هاوەڵانەی نەکردبوو، بۆیە هەستا چووە ناو بازاڕو بانگی ڕاهێشت بەدەنگێکی بەرز بانگی خەڵکی بازاڕەکەی کردوو ووتی ئەی خەڵکینە: نازانن وا لە مزگەوتەکەی پێغەمبەری نازدار (ﷺ) میراتی پیغەمبەر دەبەخشرێتەوە! زوو بڕۆن تا ماوەو بەرتان کەوێت! ئەو خەڵکە هەموو سام گرتی بوون و! سەریان سووڕماو! میراتی پێغەمبەری خودا(ﷺ)! بۆ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) چی هەبوو تا ببێتە میرات! ئەی لەو کاتەی کە کۆچی فەرموو زرێیەکەشی بارمتە (ڕەهن) نەبوو لای جوولەکەیەك بەرامبەر چەند ڕبە جۆیەك؟! ئەی خاتوو عائیشەی دایکمان نەی فەرموو: ئەو ئێوارەی پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) کۆچی فەرموو زەیتمان لە ماڵە دراوسێیەك قەرز کرد؟! میراتی چی؟!! بەڵام ئەمە ئەبو هورەیرەیە خۆشەویسترین و نزیکترین هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) دیارە شتێك هەیە ئێمە نایزانین، گومانیش لە ڕاستگۆیی ئەو هاوەڵە بەرێزەدا نیە. بۆیە هەر هەموو ئەو خەڵکە زۆر گورج و گۆڵیەوە ڕوویان لەمزگەوتەکەی پێغەمبەری ڕێزدار کرد(ﷺ) هەرچی دەهات جگە لە چەند کەسانێك کە هەندێکیان خەریکی نوێژ کردن بوون و هەندێکی تریان قورئانیان دەخوێند هیچی تری نەدەبینی، هەرچی دەهات سەیرێکی مزگەوتەکەی دەکردو دەی ویست بگەڕێتەوە بۆ بازاڕ بەڵام ئەبو هوریرە پێی دە ووت دانیشە، تا خەڵکێکی زۆر کۆ بۆوە، ئینجا ئەبو هوریرە ڕووی لە موسڵمانەکان کردو فەرمووی: ئەی یارانی

پێغەمبەر(ﷺ) چۆن وا زوو پشتتان لە دینی پێغەمبەرەکەتان کرد(ﷺ)؟! بۆ وا زوو دونیا هەڵی خەڵەتاندن و فریوی دان؟! ئایا ئێوە نازانن میراتی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەتان چ بوو؟ چی بۆ ئێوە جێ هێشت؟ ئەی نازانن ئەو نوێژو قورئانە پیرۆزە میراتی پێغەمبەرەکەتان بوو بۆ ئێوەی جێ هێشتووە؟! ئا لەم کاتەدا هاوەڵەکان هەر هەموویان داچڵەکین و هەست و سۆزیان جولاو بە چاوی بە فرمێسکەوە باوەشیان لە ئەبوهورەیرەدا: ووتیان بەڕاستی ئامۆژگاریت کردین و گەورەترین وانەت فێر کردین.

## ئەوەی پێویستە لێرەدا باس بکرێت و ڕوون بکرێتەوە:

* کارو کاسبی حەرام نیە، ئەگەر لە ئەندازە دەنەچێت و، بە شێوەو شێوازێکی شەرعیو حەلال بێت.

* بەدەست هێنانی رزق و رۆزی بە ڕێگاو شێوازی حەلال و دروست نەوەك هەر حەلالە، بەڵکو عیبادەتە و پاداشتی لەسەر وەدەگیرێتەوە.

* بەڵام ئەگەر بازاڕو کڕین و فرۆشتن ببێتە مایەی بێ ئاگابوون و دوور کەتنەوە لە خوداو گوناهو تاوان ئەمە شتێکی خراپە.

* موسڵمان دەتوانێت بازاڕو شوێنی کارو پیشەکەی بکات بە محراب و پەرستگا، بە کردارو کردەوەی چاکی موسڵمانەی وەك:

١ـ خوێندنی زیکری هاتنە بازاڕ کە بە هۆیەوە دەبیتە خاوەنی یەك ملیۆن پاداشت و، یەك ملیۆن گوناهو تاوانت لەسەر لادەبات و، یەك ملیۆن پلە لە بەهەشت بەرزت دەکاتەوەو، خانوەکیشت بۆ دروست دەکرێت لە بەهەشت.

٢ـ زۆر سەلام کردن لە خەڵکی بازاڕ، یەکێ لە پیاو چاکان هەموو بەیانیەك دەچووە بازاڕ پێیان دەووت: باشە تۆ کارێك ناکەی بۆچی دەچیە بازاڕ؟ دەی ووت: بەڵێ منیش کارو بازرگانی دەکەم، بەڵام بازرگانیەکەی من لەگەڵ خودای گەورەیەو بۆ تووێشووی قەبرو

قیامەتمە، ئەو کارو کاسبیەی من تەنها (سەلام) لـە موسـلْمانان دەکـەم، بەهـەر سـەلامێك بەلای کەمەوە دەبمە خاوەنی (دە) خێرو پاداشت.

٣ــ هەلْـسوکەوتی جـوان و رەوشــت و ئاکــاری موسـلْمانانەی وەك نــەرم و نیــانی و لەسەرخۆیی لە کڕین و فرۆشتن گفتوگۆدا، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرمووێ:(رحم الله امرءا سمحا إذا باع، وسمحا إذا اشترى، وسمحا إذا اقتضى) واتە: (رەحمەتی خودای گەورە لـەو بەندەی دلْفراوان و نەرم و نیان و لە سەرە خۆیە کاتیّ کـە دەفرۆشـێت و، کـاتیّ دەکڕێـت و، کاتیّ کە ناو بژیوانی دەکات).

٤ـ ڕاستگۆیی و سەر ڕاستی لە کڕین و فرۆشتن و مامەلْـەدا: پێغەمبــەری سـەروەر(ﷺ) دەفەرمووێ: (التاجر الصدوق مع النبيين والصديقيين والشهداو والصالحين)) واتـە: (بازرگـانی سەر ڕاست و ڕاستگۆ لە ڕۆژی دوایی دەبێتە هاوڕێ و دۆسـتی پێغەمبـەران و ڕاسـتگۆیان و شەهیدەکان و پیاوچاکان).

٥ـ مالْ بەخشین و یارمەتی دانی هەژارو نەداران، برای بازرگان و خودا پێداو بزانـە هـەر کەسێك بەکوێرەی ئەو بەهرەو نیعمەت و چاکەی کە خودای گەورە لەگەلْی کردووە، خزمــەتی موسلْمانان بکات و یارمەتیان بدات، کەوابوو تۆی بازرگان خاوەنی مالْ و سامانی بۆیە بزانە ئەو مالْ و سامانە ئەمانەتی خودایەو مولکی خودای گەورەیە لـەژێر دەسـتی تـۆی دانـاوە، بەهەشتی بۆ خۆت پیّ بکڕە وەك خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَأَنفَقُواْ لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ ﴾ {ســورەتی الحدیــد: ئایــەتی٧} واتە:(خەلْكینە ئیمان و باوەڕی دامەزراو بهێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی، لەو مالْ و سامانەی کە خستویەتیە ژێر دەستان جێنشینن تیایدا، ببەخشن، بێگومان ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە لەئێوە مالْ و سامان دەبەخشن پاداشتی گەورە چاوەڕێیانە).

## بەرنامەی ڕۆژووەوانی کاسبکارو پیشەکاران لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز:

برای گەورەو سەنگینم: بزانە ئەو مانگە وەرزی خێرو پاداشت و چاکەیە، کەوابوو ئەو مانگە لە دەست خۆت مەدەو ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکە:

ا- ئەگەر ئیش و پیشەکەت گران و سەختە، هەوڵدە تۆزێك کاتەکانی کارەکەت کەم بکەوە، ئەگەرنا دەتوانی شەوان کارەکەت ئەنجام بدەی.

ب - ئەو کەسانەی ڕووت تێدەکەن و داوای یارمەتیت لێ دەکەن، لەگەڵیان نەرم و لەسەرەخۆبەو ڕێگای چاك و باشیان پێ نیشان بدە.

ج - زیکر شتێکی ئەو تۆیە هیچ ماندوبوون و زەحمەتی ناوێت، لە کاتی کارو ئیشدا بێ ئاگا مەبە لەو کارە پڕ لە خێرو پاداشتە.

د - نابێت هەر لەسەرەتاوە بریاری بەرۆژوو نەبوون بدەیت، بەڵکو دەبێت هەموو ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز نیەتی بەرۆژوو بوون بێنی و پارشێو بخۆیت و، لەبەڕۆژووبوونەکەت بەردەوام بی تا ئەو کاتەی لە تواناتدایە هەر کاتێ توانات نەما و دەتزانی هیلاك دەبی و زەرەرو زیانت پێ دەگات دەتوانی ڕۆژووەکەت بشکێنی.

بزانە کردەوەکانت بزر نیە لای خودای گەورە دەفەرمووێ:﴿ وَقُلِ ٱعْمَلُوا۟ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَـٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ {سورەتی التوبە: ئایەتی ١٠٥} واتە:(بەو خەڵکە بڵێ: ئێوە هەر چی دەتوانن لە کارو کردەوە ئەنجامی بدەن، چونکە خوا کارو کردەوەتان دەبینێت و (ئاگادارە بە نهێنی و ئاشکرای) هەروەها پێغەمبەرەکەشی (ئاگادار دەکات کاتێك لە ژیاندایە، دوای وەفاتیشی بۆ خوای گەورە ئاسانە کە نیشانی بدات)، هەروەها ئیماندارانیش (ئاسەوارو دەرەنجامی دەبینن) پاشان دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو خوایەی کە زانایە بەنهێنی و ئاشکرا، ئەوسا ئاگادارتان دەکات لە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن)

لە کۆتاییدا: وا مەزانە ڕەمەزان مانگی نووستن و تەمەبەڵی یە بەڵکو مانگی هەوڵ و تێکۆشان و خەبات و بەدەست هێنانی دەسکەوتەکانە، ژیاننامەی بۆنداری پێغەمبەری سەروەرو(ﷺ) پیاوچاکانی پێشووش چاکترین بەڵگەیە بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیە:

* غەزای بەدری گەورە لە حەڤدەی مانگی ڕەمەزاندا ساڵی دووەمی کۆچی ڕوویدا.

* ئازاد کردنی شاری مەککەی پیرۆز لە دەی مانگی ڕەمەزانی ساڵی هەشتەم ڕوویدا.

* غەزای حونەین لە ڕەمەزانی ساڵی هەشتەمی کۆچی ڕوویدا

* لە مانگی ڕەمەزاندا پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەرچوو بۆ حودەیبیە، بەمەبەستی ئەنجامدانی عومرە.

* ئازاد کردنی وولاّتی ئەندەلوس لە ڕەمەزانی ساڵی (٩٢ )ك بەرامبەر (٧١١)ز، بە سەرکردایەتی(تاریقی کوڕی زیاد)، کە ئیتالّیای ئێستایە.

* بریاری گۆڕانکاری بدە: شارەزایی خۆت هەڵسەنگێنە بە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە بزانە چەند زانیاریت سەبارەت بەشتانێك پەیوەستە بە بەختەوەری ژیانت لە دونیادا، وە پرسیارەکانی ناو قەبر لەناو گۆڕتدا، هەموو پێشهاتەکانی ڕۆژی دوایی تا چوونە بەهەشت و دۆزەخ ـ خودای بمانپارێزێت ـ :

پ/ ئەرکانی ئیسلام چەندە؟

پ/ ئەرکانی ئیمان چەندە؟

پ/ ناوی پێغەمبەرو(ﷺ) باوکی و باپیری چی یە؟

پ/ ناوی خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) چی یە؟

پ/ قورئانی پیرۆز چەند جوزء ـ بەشە ـ؟

پ/ لە تەمەنی چەند ساڵی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو بە پێغەمبەر؟ لە تەمەنی چەند ساڵی وەفاتی فەرموو؟

پ/ چەند پێغەمبەر ناویان لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە؟

پ/ ووشەی (الفاتیحە) مانای چی یە؟ کە ناوی سورەتێکە موسڵمان ڕۆژانە بەلای کەم حەڤدە جار دووبارەی دەکاتەوە.

پ/ ﴿ اللَّهُ الصَّمَدُ ﴾ مانای چی یە؟ کەئایەتێکی سورەتی الإخلاص ((قل هوالله أحد))ە.

پ/ ووشەی (إله) مانای چی یە؟ کە ڕۆژانە چەندین جار دەڵێین: (لا إله إلا الله) .

دەی براکەم بزانە وەڵامی چەند پرسیار دەزانی لەو پرسیارانە!

بەرنامەی ڕۆژوەوان: دوای نوێژی نیوەڕۆ:

١ـ وانەیەکی شەرعی بخوێنە.

٢ـ کیتابێکی بەسوود بخوێنەوە.

٣ـ بەشێك قورئان بخوێنە.

خۆشەویستان: ئەومانگی ڕەمەزانە بگێڕە بەوێستگەی گۆڕانکاری کردن لەئایینەکەی خۆت، بزانە چ کارێکت بەئەوپەڕی دڵسۆزی کردووە بۆخودای گەورە، شانازی پێ بکەو سەرفرازبە پێی.

# خەلاتی بیست و پێنجەمین

## وولاتی سودان پڕە لەسوودان

ڕۆژووەوانی مانگی ڕەمەزانی پڕ لە خێرو بەرەکەت مرۆڤ هەرچەندی لەو دونیایەبگەڕێت زیاتر شتی باش و خراپ دەبینێت ئەو شتانەش کە دەیبینێت بۆ موسڵمانی ژیر و تێگەیشتوو دەبێتە سوودو قازانج و پەندو ئامۆژگاری وەرگـرتن، ئینجـا ئەگـەر ئـەو شـتەی دەیبینێـت شتێکی باش و جوان سەرنج ڕاکـێش بـوو، سوپاسـی خـودای گـەورەی دەکـات کەئـەوی لێ پاراستووەو بەدوور گرتووە، وە ئەگەر شتەکە شتێکی باش و جوان بوو هـەوڵ دەدات لـەخۆی بێنیتە دی و خۆی پێ دەڕازێنێتەوە.

ئەو وولاتی سودانەی بەندە بینی بەڕاستی شتانێکی ئـەو تـۆی تێـدا دەبینـدرێت کەلـەو سەردەمەی ئێستا زۆر سەیرو سەرسوڕهێنەرە، هەندێکیان زۆر دڵخۆشکەرو موژدەبەخـشن و، هەندێکیش لـەو شـتانەیان زۆر ناخۆشـە بەشـێوەیەکی ئـەو تـۆ فرمێـسك لـە چـاوی مـرۆڤ دەبارێنێت.

### یەکێ لەو نموونانەی بینیم:

گەنجێك هەبوو بەناوی(موحەمەد غانی) خەڵکی وولاتی (غانـا) بـوو، ئـەو جگـە لـەوەی بەیانیان لە زانکـۆ دەیخوێنـد دوای نوێـژی (مـەغریب)لـە مزگەوتەکـەی گەڕەکەکـەی ئێمـە خانومان لێی بـەکرێ گرتبـوو، چـەند مامۆسـتایەکی بەڕێزوشـارەزا وانـەیان لـەو مزگەوتـە دەگوتەوە ئەو گەنجەش دەهات بەشداری ئەو وانانەی دەکرد، ڕۆژێك دوای یەکتر ناسـین چـەند پرسیارێکم لێی بەمەبەستی شارەزا بوون لەبارودۆخی خەڵکی ئەو وولاتانە - چـونکە سـودان یەکێکە لەو وولاتانەی زۆرترین قوتـابی زانـستی بەتایبـەت زانـستی شـەرعی لێیـە تـەنها لە(زانکۆی ئەفریقیای جیهانی) زیاتر لەقوتابیانی هەشتاو سێ وولاتی تێدا دەخوێنێـت، ئـەو (موحەمەدغانیە)ش یەکێك بوو لەقوتابیانی ئەو زانکۆیە بەڵام کـاتێ پرسـیارم کـرد لەبـژێوی

ژیانی ئەو گەنجە لەتەمەنێکی زۆر گەنجیەتی دابوو خاوەنی خێزانێك و سێ منداڵبوو، قۆناغی سێیەمی کۆلێژبوو ماوەی ئەسێ ساڵەش نەگەڕابۆوە بۆ وولاتەکەی خۆیی چاوی بەماڵو منداڵە خنجیلەکانی نەکەوتبوو، پرسیارم لێی کرد ئەی چۆن هاتووی بۆ ئێرە؟ ووتی: ڕێکخراوێك تەنها هێنانی ئێمەی لە ئەستۆ گرتووەو ئێمە هێناوە بۆ ئەو وولاتە لەسەر خەرجی خۆیان. ووتم:ئەی بژێوی ژیانت چۆنە لێرە؟ ووتی: (واللە) ڕێکخراوی قوتابیانی دەرەکی هەندێ مانگ بیست (جونەیهی)سودانیمان پێ دەدەن ئەویش هەموو مانگێك نیە- بیست (جونەیە) لەهەزار دیناری بریەری خۆمان کەمتر دەکات -. ووتم: ئەی چۆن تەلەفۆن لەگەڵ خێزان و منداڵەکانت دەکەی هۆکارەکانی گەیاندن لای ئێوە چۆنە ووتی: یەك کارتی (دە) (جونەیهی) تەنها پێنج دەقە دەتوانم قسەی پێ بکەم.

کاتێ ئەم قسانەم لێی بیست زۆر دڵم لێی پەست بوو، بۆیە پێیم ووت: باشە چۆن دەبێت تۆ خۆت وئەو ماڵ و منداڵەت توشی ئەو هەموو ناخۆشی و دەردەسەریە بکەیت؟ کەوام پێی ووت: هەردوو چاوەکانی پڕبوو لەفرمێسك و ووتی: (یا شیخ) (واللە)ی تۆ نازانی ئەو ڕێکخراوە مەسیحیانە چی دەکەن چۆن خەڵك بە لێشاو دەکەن بە مەسیحی و کافریان دەکەن، لەو وولاتەی ئێمەش بریار وایە ئەوەی بڕوانامەی زانستی شەرعی نەبێت ناتوانێت بانگەوازی بکات، بەبەرچاوی خۆمان خزم و کەس و دۆستانمان دەبینین دەبن بەمەسیحی ئێمەش هیچ نازانین تا تێیان بگەیەنین و لە ئیسلام، بۆیە من ئامادە بوومە خۆم و ماڵ و منداڵم بکەمە قوربانی بۆ خزمەتی ئیسلام و پارێزگاری کردنی بیروباوەڕی موسڵمانان.

ئەمە تێگەیشتن وبیرکردنەوەی گەنجێکی ڕەش پێستی ئەفریقی هەژارە کە ڕەنگە هەر یەکێك لە ئێمەی لەجوانی و دەوڵەمەندی و هەموو شتێك خۆمان بەو نەدەین و خۆمان زۆر پێ باشتر بێت لەو.

برادەرێکی کوردی خەڵکی سولەیمانی کەبۆ زانستی پزیشکی لەسودان دەیخوێند ووتی: ئاژەڵێکمان سەربڕی بۆ قوربانی بردمانە گەڕکێك کەهەژار نشینترین گەڕەك بوو، کاتێ گۆشتەکەمان دابەش دەکرد بەسەر خەڵکەکە هەندێ کەس کە دەیزانی گۆشتە وەری

نەدەگرتو پێمانی دەداوە ئێمەش پرسیارمان لێیان کرد بۆچی وەری ناگرن؟ ووتیان: ئێمە ساڵێ جارێك بەبۆنەیەکی وا گۆشت دەخوێن بۆیە پێی توشی نەخۆشی دەبین لەشمان لێی ناکەوێت.

ئەمە هەژاری و نەداریەکەیتیان بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بزانە چەند بەویژدان و بەبەزەیی و رازین بەبەش و پشکی خۆیان:

موسڵمانێك ووتی: چومە مزگەوتێك لەمزگەوتەکانی سودان وابـاوە لەو وولاّتە لەبەر زۆری هەژارو نەداران لەبەر دەرگای هەرمزگەوتێك چەندین پیرە پیاوو ئافرەت ومنداڵ و خەڵکی رەش و رووت و داماو لەدوای یەك دەوەستن، لەیەکێ لەمزگەوتەکان دووسێ هەژار لەدوای یەك راوەستابوون موسڵمانێکیش جونەیهێکی بەیەکێکیاندا دیارە ئەمەیان دوو جونەیهی پێدراوە کەبەشی بژێوی ئەرۆژەیەتی ـ کە دەکاتە نزیکەی حەفسەد دینارێکی بریەری خۆمان ـ کەهەر جونەیهێك بەشی جەمێکی خواردنیانە، بەڵام ئەو پیاوە بەویژدان و موسڵمانە ووتی: بیدە بەوەی دواوەی من من (عیشی)خۆم بژێوی خۆم پەیدا کردووە.

ئەوەی زۆر سەیرو جێگای سەرنجە ئەو وولاّتە لەئەو هەژاری و نەداریەی خۆی (واللە)ی سەرت سورِ دەمینێ لە ئاین پەروەری و زانست پەروەری خەڵکی ئەو وولاّتە:

برادەرێك ووتی: باسی زانست وزانیاری مامۆستایەکی کوردی خۆمانم کرد زۆربە گرنگی یەوە ووتم: هەموو قورئانیشی لەبەرە، ئەو پیاوەش سەیرێکی کردم و ووتی: بۆ لەبەرکردنی قورئانیش شتێکی گرنگ و گەورەیە لای ئێوە ماوەیەك لەمەو پێش سەرژمێریەك کرا تەنها دوازدە هەزار قورئان لەبەر هەیە.

بەراستی شەرمم لەخۆم کردەوە، زۆربەی ئەوانەی پێش نوێژی دەکەن لەمزگەوتەکان بەهەر حەوت جۆرە شێوەکەی قورئان خوێندن واتە(قراءات السبع) قورئانیان دەخوێند، تا ئەو مزگەوتەی ئێمە نوێژمان لێ دەکرد لە هەر نوێژێك لەنوێژە بەدەنگەکان لەهەرنوێژێك بەجۆرێك لەجۆرەکانی قورئان خوێندن قورئانی لەپێش نوێژیدا دەخوێند.

نەك تەنها بۆقورئان وخوێندنی شەرعی بەڵکو (واللە) ئەو دەرۆزەی دەکات و نان لەدەمی خۆی و ماڵ و منداڵی خۆی دەگرێتەوە بەس تا منداڵەکانی بخوێنن و ببن بەخاوەنی بڕوانامە، موسڵمانێکی کورد کەخۆی بۆ بۆردی پزیشکی و خێزانەکەشی بۆ ئەندازیاری لەوێ دەیان خوێند دووکچ لەگەڵ خێزانەکەم قوتابی بوون بەڵام تا بڵێی داماوو هەژارو نەدار یەکێ لە کچەکان زۆربەی رِۆژ کە دەهات بۆ کۆلێژ شڕە نەعلەیەکی - دوور لە ڕووی خوێنەر- تا پێی دەگەیشتە کۆلێژ بنەکەی هەڵدەتەکاو لێدەبۆوە بۆیە ئەم کچە دەرزی و داوێکی پێبوو دەچووە سووچێکەوە بەکزۆلەیی و نەعلەکەی دەدوریەوە.

براو خوشکی بەرِێزو گەنج و لاوی خوانـاس: ئەمـە حـاڵی خەڵکانێکـە کـە لـە ئـایین و بڕواداریەوە براو خوشکی تۆن ، ئەگەر هیچ نەبێت بەدوعاو نزاکانت لەبیریان مەکـە، قـەدری ئەو نازو نیعمەتانەی خودای گەورە بگرەو، سوپاسگوزار بەو بزانە تۆ لەناو چ نازو نیعمـەت و خۆشیەکدا، پرسیاری هەرهەمووشت لێ دەکرێتەوە وەك خودای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴾ {سورەتی التكاثر: ٨}

ڕاستە هەژارو نەدارن بەڵام زۆر خۆڕاگرو خاوەن هەڵوێـست و دامـەزراون لەسـەر ئـایین و بڕواکەیان:

(شیخ إسماعیل حەنەفی) زانایەکی بەناوبانگ و ناوداری مزگەوتێکی نزیك ئـەو گەڕەکـە بوو کە ئێمـە تێیـدا نیـشتەجێ ببـووین، بڕوانامـەی دوکتـۆرای هـەبوو لەشـەریعەدا پلـەی پرۆفیـسۆری هـەبوو، بـەم دوایـیـەش وولـاتی سـعودیە بـە ڕەسمـی بانگهێـشتی کـردو تالـە زانکۆکانیان وانە بڵێتەوە ئەم مامۆستا بەرِێزە فەرمووی:

پیاوێکی مەسیحی ناردراوەتە سودان تا خەڵکەکانی بکاتە مەسیحی هەرچـی خـەرجی و ماڵی دونیا هەیە خستۆتینە بەر دەستی بەس بۆئەوەی خـەڵکێك هەڵبگەرێنێتـەوە لـەئایینی خۆیان و بیان کاتە کافر بەڵام دوای بیست وچـوار سـاڵ گـەڕان و سـوڕان و هەولـدان لەگـەڵ خەڵکی ئەو شارە تەنها تاکە کەسێکیشی پێ هەڵناخەڵەتێ پێی ناکرێتـە مەسـیحی، تـەنها

چەند ڕۆژێکی ماوە بگەڕێتەوە وولاّتەکەی خۆی بۆیە هەموو هەولّی خـۆی هەیـە دەخاتەگـەڕ بەس ئەگەر چ نەبێت تەنها کەسێکیش بکاتە مەسیحی بەیانیەکی زوو بەناو بازاڕدا دەگەڕێت ئافرەتێکی بەتەمەنی نەخوێندەوار دەبینێت کە (فولی سودانی) دەفرۆشێت ـ لەسودان وابـاوە پاقلەی کولاّو دەخۆن ،بۆیە لەزۆربەی شوێنێکان دەی فرۆشن ـ دەچێتە لای هەندێ (فولی) لێ دەکرێت و دەیەوێت بیکات بە مەسیحی پێی دەلێت: تۆ موسلّمانی؟

ئەویش دەلّێت: بەلّێ موسلّمانم

پێی دەلّێت: (عیسا) چی لێ هات؟

ئەویش دەلّێت: بەرز بۆوە بۆ ئاسمان وەك خودای گەورە وای فەرموە.

دەلّێت: ئەی (موحەممەد) چی لێ هات؟

دەلّێت: وەفاتی کردو مرد.

دەلّێت: باشە من پرسیار لەتۆ دەکەم زیندوو باشترە یا مردوو؟

ئەو ئافرەتە تێگەیشتووەش دەلّێت: منیش پرسیارێك لەتۆ دەکەم ئایا (مەریەم)ی دایکی (عیسا) پێغەمبەر زیندووە یا مردووە؟

دەلّێت: مردووە.

ئایا من زیندووم یا مردووم؟

دەلّێت: زیندووی.

ئەویش دەلّێت: کەواتە بەقسەی تۆ بێت دەبێت من لە(مەریەمە) باشترو گەورەترم.

ئەو کابرایە دەلّێت: خەلّکانێك ئافرەتەکانی سەر جادەو (فول) فرۆشـەکانیان ئـاوا بێـت، دەبێت خوێندەوارەکانیان چۆن بێت!

## بەرنامەی ڕۆژووەوان:

١ـ لەو ڕەمەزانەپیرۆزەوە پەیوەندی لەگەڵ مامۆستای مزگەوت ببەستەوکوڕەکانتی لەلادابنێ تافێری قورئانی پیرۆزو زانستی شەرعی ببن، بەهەمان شێوە کچەکانت بالای خێزانی مامۆستا بخوێنن.

٢ـ ژمارەی مۆبایلی هەندێ لەمامۆستایانی ئایینی وەربگرەو لەشوێنێکی بەرچاوی ناومالەکەت هەلبواسە، تاهەر لەکاتێ پێویستی بۆ پرسیاری شەرعی پەیوەندیان پێوەبکەن .

بڕیاری گۆڕانکاری بدە:

لەهەر شوێنێك گوناهو خراپەیکت کردووە چاکەو خێرێك لەوشوێنە بکە تا ببێتە ڕەشکەرەوەی گوناهو تاوانەکان.

# خەلاّتی بیست و شەشەمین

## گەنجە دڵنەرم و خزمەتگوزارانی ڕۆژووەوانان

کاتێ مانگی ڕەمـەزانی پـیرۆز دەگاتـە ڕۆژەکـانی کۆتـایی موسـڵمانان تۆزێـك هەسـت بەلاوازیو بێ هێزی دەکەن بەتایبەت لەوساڵانەی ئێستا کەمانگی ڕەمەزانی پیرۆز دەکەوێتـە ناوەندی وەرزی گەرما و ڕۆژەکـانی درێـژن زیـاتر هەسـت بەمانـدووبون دەکرێـت بەتایبـەت ئەوانەی بەساڵاچوو بەتەمەنن.

بەڵام مام حاجیـەکی بەتەمـەن و بەساڵاچـوو ڕەمـەزان کـاری لـەدڵ و دەروون کـردووەو ئاوێتەی گیان خوێنی ببوو،کاتێ ئێوارە نزیك بەربانگ و کاتی ڕۆژوو شکاندن، کەهەر یەکـەو باسی جەژنی دەکرد، دوای چەند ڕۆژی تر چەژنە بـەڵام ئـەو مامـە پـیرە کـانی بەساڵاچـووە بەهیممەتە ووتی: (واللە) هەموو بەربانگێکی ڕۆژێکی ڕەمەزان لای من چەژن بووە.

بـەڵام لەمـەش خۆشـترو بەچـێژتر هاتوچـۆو خزمـەتگوزاری گـەنج و لاوە دینـدارو خواناسەکانی مزگەوتە کە وەك کۆترە بێ گوناهەکانی مزگەوت لەحەوشـی مزگـەوت دێـن و دەچن حەوشی مزگەوت دەشۆن و سفرە ڕادەخەن و ئاوو خورما و شیرنەمەنی بـۆ ڕۆژووەوانـان ئامادە دەکەن، موسڵمانانیش بە پیرو گەنج و منـداڵ لـەدەوری سـفرە دادەنیـشن چـاوەڕوانی بانگ و بەربانگ دەکەن، هەر یەکەو بەشێوەیەك خوداپەرستی دەکات یەکێ دەستەکانی بەرز کردۆتەوەو خەریکی پاڕانەوەو نزایە، یەکێکی تر باسی نازو نیعمەتی خودای گـەورە دەکـات، گەنج و لاوانیش بەگەرم و گوڕی خەریکی دابەش کردنی خواردن و خواردنەوەکانن.

بەڕاستی ئەگەر بە ووردی سەرنج بدەی ئینجـا دەزانـی چـەند وێنـەو دیمـەنێکی جـوان و دلڕفێنە.

بەڕاستی کەش و هەوایەکی ئیمانی و ڕۆحی یە تەنها سەیرکردنی ئەو دیمەن و ئەو هەموو جۆش و خرۆشەی موسڵمانان بڕوای موسڵمانی پێ زۆرو زیاد دەبێت.

## خوشك و برای گەنجی بەرێز:

تەمەنی گەنجایەتی خۆشترین قۆناغە ئەگەر دینداری لەگەلّ بێت.

قۆناغی لاویەتی کاتی هێزو تواناو تەواوبوونی بیرو هۆشی مرۆڤە.

دوای قۆناغی گەنجایەتیش قۆناغی تەواوبوونە لەو قۆناغەدا خودای گەورە پێغەمبەرانی ناردووەو کردوونیەتی بەپێغەمبەر(سەلامی خودای گەورەیان لەسەربێت)

گەنج بڕبڕەی پشتی هەموو نەتەوەو گەلێکە.

## ڕۆلّی گەنج و لاو لەگەیاندنی پەیامی خودای گەورە:

* هەموو پێغەمبەرانی خودای گەورە لەتەمەنی (٤٠) چل سالّی بوون بەپێغەمبە

* زۆربەی زۆری ئەوانەی پشتیوانیان لەپەیامی پێغەمبەران کردووە گەنج و لاو بوونە.

* (یارانی ئەشکەوت) ئەوانەی شۆرشێکیان بەرپا کرد لەدژی کوفرو شیرك و خوانەناسیو، راگەیاندنی ئایینی ڕاست و دروست،کۆمەلّە گەنج و لاوێك بوون وەك خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِالْحَقِّ ۚ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى ﴾ {سورەتی الكهف: ١٣}

* گەورەمان (ئیبراهیم) پێغەمبەر (سلامی خودای لەسەربێت) کاتێ شۆرشی یەکتاپەرستی هەلّگیرساند لەدژی بت پەرستی لەقۆناغی گەنج و لاویەتی دابوو خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ ﴾ {سورەتی الأنبياء: ئایەتی ٦٠}

* بەسەرهات و سەرگۆزەشتەی (ئەسحابی ئوخدود) کەشورش و راپەرینێك بوو لەدژی مرۆڤ پەرستی و کوفرو ستەم و، بەرزڕاگرتن و بەگەورەدانان و ڕاگەیاندنی یەکتاپەرستی بۆ خودای تاك و تەنیا لەسەر دەستی لاوو گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بوو.

## خوشكی بەڕێز:

* خاتوو مەریەمەی دایكی (عیسا) پێغەمبەر(سەلامی خودای لەسەر بێت) گەورەترین (موعجیزە) لەسەر دەستی ڕوویداو، وە بەهۆی پاكی و بێ گەردی و خواناسیەوە خودای گەورە كردی بە دایكی یەكێ لەپێغەمبەرە گەورەكان كە(عیسا) پێغەمبەرە (سەلامی خودای لەسەر بێت) خۆی و كوڕەكەی بوون بەگەورەترین بەڵگەو نیشانەی هێزو دەسەڵاتی خودای گەورەو میهرەبان،لەتەمەنی گەنج و لاویەتیدا بوو.

بیربكەوە لەرۆڵی (عائیشە) و (فاتیمە)ی جگەر گۆشەو خۆشەویستی پێغەمبەرو(ﷺ) (ئەسما) كچی پێشەوا (ئەبوبەكر) و (سومەییە) ئینجا ووردبەوەو بیربكەوە لەو تەمەنەی خۆت بزانە تۆ چیت كردووە بۆ ئەو ئایینی ئیسلامەو دوارِۆژی خۆت.

## بەرنامەت لەو مانگە پیرۆزەدا سەبارەت بەبەخشینی خێرو سەدەقەكانت:

١ـ پرسیار بكە لەو كەسەی یارمەتی دەدەیت بزانە پێویستیەكەی چەندە ئینجا بڕە پارەیەكی ئەوتۆی پێ بدە، كەباری بابای هەژار ڕاست بكاتەوە، بۆنموونە ئەگەر (٥٠) وەرەقە قەرزارە تۆ بەلای كەم (٢٠ـ٣٠) وەرەقەی پێ بدەیت.

٢ـ ئەو هەژارو نەدارانەی توانای ئیش ەكاریان هەیە، هەوڵبدە ئیش و كاری بۆ دەستەبەر بكەیت، بۆ نموونە دەتوانی چەند مەكینەیەكی دوورمانی بۆبكڕدرێت تا بۆخۆی بكەوێتە سەر پێی چی تر پێویستی بەخەڵك نەبێت.

٣ـ چەند كەسێكی دەوڵەمەندو خودا پێداو دەتوانن بەیەكەوە زەكات و خێرەكانیان كۆبكەنەوەو بەیەكەوە پرۆژەو كاری خێری پێ بكەنەوە.

## بریاری گۆڕانكاری بدە:

خوشك و برای هەژاری خۆشەویستی خوداو پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ):

خوشكی گەورەم: هەوڵبدە بەیەكجاری خۆت رزگار بكەی لەهەژاری بەوەی بەدەستەكانی خۆت بژیوی ژیانی خۆت و منداڵەكانت پەیدا بكەیت، بەهۆی كاری دوورمانی بێت یا هەركارێكی تر كەلە تواناتدا بێت

برای بەرێز: تۆش هەوڵبدە ئیشو کارێکی گونجاو بکەیت بەکرێینی (عارەبانە)یەك بۆ پەیدا کردنی بژێوی ژیانی خۆت و ماڵ و منداڵەکانت.

# خەلاٌتی بیست و حەوتەمین

## تام وچێژ ومرگرتن لەنوێژ

نوێژ بەزمانی عەرەبی پێی دەوترێت (صلاة) لە(صله)وە هاتووە واتەپەیوەندی بەستن و وابەستەکردنی موسڵمان بە خودای گەورەو میهرەبان چەندی موسڵمانیش لەنوێژەکانیدا تێکەلٌ بێت لەگەلٌ خودای گەورەومیهرەبان ئەوەندە زیاتر تام و چێژ لەنوێژەکانی دەکات و دلٌو دەروونی پاك و بێگەرد دەبێت پێی، هەر کاتێکیش موسڵمان دلٌ و دەروونی پاك و بێگەردبوو هەموو ئەندامەکانی لاشەی رێك و پێك و باش دەبن، هەروەك خودای تاك و تەنیا دەفەرمووێت: ﴿ ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴾ {سورەتی العنکبوت: ئایەتی ٤٥ } واتە: (ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی بۆت رەوانە دەکرێت لەقورئان بیخوێنەرەوەو نوێژیش بەچاکی ئەنجام بدە، چونکە بەڕاستی نوێژ بەرهەڵستی لەگوناهو تاوان و نادروستی دەکات، بێگومان یادی خوا لەهەموو شت گەورەترو بەنرخترە (کەدەبێت لەکاتی نوێژو کاتی تریشدا بیرو هۆشی ئیماندار، دابگرێت) وخوا خۆی زانایەو بەهەموو ئەو کارو کردەوانەی کەئەنجامی دەدەن).

مامۆستا(شێخ عبدالرحمانی ئازادی) کەیەکێکە لەمامۆستا خاوەن هەڵوێست وبانگخوازە ناودارەکانی ناوەو دەرەوەی (کوردستان) دەفەرمووێ لەسەردانێکم بۆ یەکێ لەویلایەتەکانی (ئەمەریکا) لەیەکێ لەبەندیخانەکانی ئەو ویلایەتە نامەیەکمان پێ گەیشت ووتیان: لەوبەندیخانەیە (پێنج هەزار) بەندی موسڵمان هەیە پێمان خۆشە سەردانێکیان بکەیت، منیش سەرم سوورِما لەویلایەتێکی وا کەموسڵمان کەمینەیە ئەو زیندانیە چ دەکات، دوای لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون بۆم دەرکەوت ئەوانە دوای ئەوەی رێگا درا بەبانگخوازانی موسڵمانان لەناو بەندیخانەکان ئەوانیش دوتوانن رۆڵی خۆیان ببینن لەناو بەندیخانەکان ئەو

خەڵکە بەهۆی بانگەوازی زانایانی موسڵمانان بوونە موسڵمان وە بەفەرمانی فەرمی ئەو وولاتە ئەوەی نوێژ بکات و هاتووچۆی مزگەوت بکات زۆر هاندەدرێت، لە ڕووی ماددی و مەعنەوی، ئەم فەرمانەش پەسند کراو بووە بریار دوای ئەوەی تێبینیان کرد هەرکەسێك لەبەندیخانەکان بەموسڵمانی دەرچێت جارێکی تر هەرگیز هیچ تاوان و خراپەیەك ناکاتەوە، جارێکی تر بەندیخانە نابینێتەوە.

تەنها دەڵێم زۆر بەداخەوە بۆ موسڵمانانی ڕۆژهەڵاتی وەك ئێمە.

(موعاویە)ی کوڕی (حەکەم) هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەری خۆشەویست بوو(ﷺ) لەشاری مەدینەی پیرۆز دانەدەنیشت و بەهۆی سەرقاڵی و دووریەوە نەی دەتوانی بەشداری بکات لەکۆڕو دانیشتنەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، لە دەشت وبیابانەکاندا ئاژەڵداری دەکرد، ڕۆژێکیان (مەعاویە) دێتە شاری مەدینەی پیرۆزو دەچێتە مزگەوت لەو کاتەدا پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) بۆیارانی باسی ئادابی موسڵمان دەکات لەکاتی پژمیندا، یەکێ لەو شتانەی کە بۆی باس کردن کاتێ موسڵمانێك پژمی و ووتی: (الحمدلله) وا سوونەتە ئەوەی کوێی لێ دەبێت پێی بڵێت: (یرحمك الله) (موعاویە) ئەمە فێربوو دوایی کاتی نوێژ داهات پێغەمبەری سەروەرو(ﷺ) یارانی نوێژی بەکۆمەڵیان ئەنجام دەدا لەمزگەوت (موعاویە)ش لەگەڵ ئەوان دەستی بە نوێژ کردن کرد، کاتێ لەناو نوێژدا یەکێ لەنوێژ خوێنان پژمی، (موعاویە) بەدەنگێکی بەرز هاواری کردو ووتی: (یرحمك الله) نوێژ خوێنەکان تۆزێك شڵەژان و، وای نوێژ تەواوبوون وەك نارەزایی دەربڕین هەریەکە لەشوێنی خۆی ئاوڕی لێی دەدایەوەو سەیری دەکرد، کاتێ (موعاویە) ئەم شڵەژان و نارەزاییەی لێیان بینی ووتی: ئەی دایکەکانتان سینگە کوتێتان بۆ بکات!! چی یە بۆ وا سەیرم دەکەن؟

هەر کەسەو لەشوێنی خۆی شەقی لەڕانی خۆی دەدا تا چیتر قسان نەکات و بێ دەنگە بێت، ئینجا بێ دەنگبوو کەنوێژەکە تەواوبوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕووی لەموسڵمانەکان کردوو بێ گومان کوێی لەدەنگە دەنگ و شلەژانەکانیان ببوو دەشی زانی دەنگەکە دەنگێکی زۆر کرا بەڵام بەتەواوی نەی دەزانی کێیە؟ بۆیە پرسیاری کرد: (کێ بوو قسەی کرد)

ئاماژەیان بۆ (موعاویە) کرد، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بانگی کرد (موعاویە)ش بەترس‌و دوو دڵیەکی زۆرەوە بەرەو ڕووی چوو نازانێت چی پێ دەڵێت و چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکات کە بووەت مایەی تێکدانی نوێژەکانیان.

(موعاویە) (خودا لێی رازی بێت) خۆی دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ: بەدایك و باوکەوە بەقوربانی پێغەمبەر بم(ﷺ) (واللە) نەلەپێشترو نەلە داهاتوودا هیچ مامۆستا و فێرکەرێکم نەبینی وەك ئەو باش کاری فێرکردن ئەنجام بدات (واللە) نەڕووی لێ گرژ کردم.. نەلێی دام.. نەقسەی پێ ووتم.

بەڵکو تەنها فەرمووی: (ئەی (موعاویە) ئەو نوێژانەی ئێمە نابێت هیچ قسەیەکی مرۆڤی تێدا بکرێت، تەنها (تەسبیح) واتە ووتنی (سبحان الله)و (تەکبیر) ووتنی (الله أکبر)و قورئان خوێندنی تێدا دەکرێت).

بەڵێ نوێژ بریتی یە لەم زیکرو ویردانەو بەس، ئەمانەش بەناخی دڵەوە بێت زیاتر زۆرتر کار لەدڵ ودەروون دەکات و موسڵمان زیاتر تام و چێژ لەنوێژەکەی دەکات.

کاتێکیش فەرمانی خودای گەورەو میهرەبان جێ بەجێ کرا خودای گەورەو میهرەبانیش دەبێتە هاوکارو پشتیوان و یارمەتی دەرت لەهەموو گرفت و کێشەکانی ژیانت دەستی پەروەردگارت دەبینی و هەست بەهێزو توانایەکی بێ ئەندازەو لەتوانابەدەر دەکەیت، وەك پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرمووێ:((إحفظ الله یحفظك، إحفظ الله تجده تجاهك)) واتە: ( فەرمانەکانی خودای گەورە جێ بەجێ بکەو بپارێزە، خودای گەورەش خۆت و ئیش و کارەکانت دەپارێزێت، فەرمانەکانی خودای کار بەجێ بپارێزە خودای گەورە دەبینی لەبەردەم هەموو پێشهاتێکی ناخۆش و کێرو گرفتێك).

ڕۆژێکیان پیاوێکی دەشتەکی عەرەب (ئەعرابی) بەبەردەم مزگەوتەکەی پێغەمبەری خودادا تێپەڕی کاتی نوێژ دەبێت، ئەویش ووڵاخەکەی لەبەردەم مزگەوتەکە دەبەستێتەوە دەچێتە مزگەوت نوێژەکەی دەکات و دێتەدەر، دەبینێ ووڵاخەکەی نەماوە زۆر پەرێشان دەبێت دوایی هەردوو دەستەکانی بەرزدەکاتەوەو دەڵێت: ئەی خودایە من ئەمانەتەکەی تۆم

جێ بەجێ کرد ئەی کوا ئەمانەتەکەی من، ئەو کابرایە کـە متمانەیـەکی تـەواوی بـەخودای گەورە هەبووە هێشتا دەستەکانی نەهێنابووە خوار یەکێ دەستێکی لەسەر شانیداو پێی ووت: کاکە گیان ئەو ووشترە ئی تۆیە بەریبوو من گرتیتمەوە.

## * بەڵێ پرسیار لەخۆت بکەو بزانە:

ئایا نوێژەکانت جێ بەجێ دەکەیت یا بارێکی گرانەو لەکۆڵی خۆتی دەکەیتەوە؟

ئایا قەت ڕۆژێك تەفسیرێکت خوێندۆتەوە سەبارەت بـەو سـورەتەی ڕۆژانـە بـەلای کـەم حەڤدە جار دەیخوێنیتەوە کەسورەتی فاتیحەیە؟

ئایا دەزانی نوێژ بەرز بوونەوەی ڕووحی ئیمانداره بەرەو خودای گەورە و خەڵکە پاکەکانی سەروو؟

ئایا دەزانی هەر دەسنوێژ شوشتنێك چ خۆشی و تام و چێژێکت پێ دەگەیەنێت؟

بیرت کردۆتەوە هەموو تەمەنەکەت وەك ئەو ماوەی نێوان بانگ و قامەت(نوێژدابەستنە) سەرەتای دەسپێکردنی ژیانت بە بانگ دەست پێدەکات، کۆتاییەکەشی بەنوێژێکی چـوار (الله أکبر)ی کۆتایی پێ دێت.

## * پێناسەی نوێژ:

نوێژ ناسنامەی موسڵمانە.

نوێژ یەکەم پرسیاری ڕۆژی دواییە.

نوێژ تاکە فەرزو فەرمانێکە بەبانگهێشتێکی تایبەتی پێغەمبەر() فەرزکرا.

نوێژ لابەرو خاوێنکەرەوەی گوناهو تاوانە.

نوێژ ئارامی دڵ و دەروونە.

نوێژ بەڵگەو نیشانەی ئیمانداری ڕاستەقینەیە.

نوێژ: خوداناسی و خۆناسیە

نوێژ: بەخشەری تام و چێژی ئیمانیە.

ڕۆژووەوانانی خۆشەویست و موسڵمانانی ڕێزدار: با لەو ڕەمەزانەوە بەنوێژەکانی خۆماندا بچینەوەو گۆڕانکاری بکەین لەنوێژەکانمان و بەرنامەیەکی تایبەتمان هەبێت بۆ قۆزتنەوەی هەلە زێڕینەکانی ئەو مانگە پیرۆزە:

* هەوڵبدە ئەو موزگێنی ئەو دوو خەڵاتەی پێغەمبەری خودا لەو ڕەمەزانەدا بەدەست بێنیت، کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێت: ((من صلى أربعين يوما في جماعة يدرك تكبيرة الأولى كتب له براءتان: براءة من النفاق و براءة من النار)) {تیرمذی گێڕاویەتیەوە} واتە: (هەر کەسێك چل ڕۆژ نوێژ بە کۆمەڵ بکات بە(الله أكبر)ی یەکەمی نوێژ دابەستن ڕابگات لەدوو شت رزگاری دەبێت: رزگاری دەبێت لەدووڕوویی، وەرزگاری دەبێت لەئاگری دۆزەخ)

بۆ بەدەستهێنانی ئەو خەڵاتەش: (دە) ڕۆژبەر لە هاتنی مانگی ڕەمەزان، لەگەڵ(سی) ڕۆژی مانگی ڕەمەزان هەموو نوێژکانت بە کۆمەڵ بێت لەگەڵ دەکاتە (چل) ڕۆژ ئەگەر نا هەوڵبدە مانگی ڕەمەزان بەتەواوی و لەگەڵ (دە) ڕۆژی دوای مانگی ڕەمەزان نوێژەکانت بەکۆمەڵ بێت ئەو پاداشت و خێرو خەڵاتەت دەست دەکەوێت.

* ئەگەر هەر نەبێت زۆر ئاگاداری نوێژی بەیانی و نوێژی (عیشا) خەوتنان بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێت: ((من صلى الصبح في جماعة فكأنما قام الليل كله، ومن صلى العشاء في جماعة فكأنما قام نصف الليل )) واتە: (ئەوەی نوێژی بەیانی بەکۆمەڵ بکات وەك ئەوەیە ئەو شەوە تا بەیانی شەوو نوێژی کردبێت، وە ئەوەی نوێژی عیشا بەکۆمەڵ بکات وەك ئەوەیە نیوەی ئەو شەوەی بەشەوو نوێژ بەسەربردبێت)

* هەوڵبدە ڕۆژانە بەلای کەم دوازدە رکات نوێژی سوونەتت کردبێت پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) دەفەرمووێ: ((من صلىَ في اليوم اثني عشر ركعة بنى الله له بيتا في الجنة)) واتە: (ئەوەی ڕۆژانە دوازدە رکات نوێژی کردبێت خودای گەورە خانوویەکی لەبەهەشت بۆدروست دەکات).

## بەرنامەی ڕۆژووەوان سەبارەت بەنوێژە سوونەتەکان:

١ـ هەموو نوێژە سوونەتەکانی پێش و پاشی نوێژە فەرزەکان جێ بەجێ بکە.

٢ـ نوێژی چێشتەنگاو بکە.

٣ـ نوێژی چوونە ناومزگەوت بکە.

٤ـ زۆر ئاگاداری نوێژی (تەراویح) بە.

بڕیاری گۆڕانکاری بدە:

خوشك و برای بەڕێز: بەتەواوی شارەزا بـە لـە(حیجـاب) پۆشـاکی شـەرعی ئافرەتـان ، ئەوئایەتانەی دەربارەی هاتووە بیخوێنەوە، ئینجا خوشکی خۆم سەرنجێکی بەرگەکـەی خـۆت بدەو، برای موسڵمان تۆش ووردبەوە لە بەرگی خێزان و کچەکەت .

# خەلاتی بیست و هەشتەمین

## تۆڵەکردنەوەی خودای گەورە دەبێت چۆن بێت؟!

(شێخ موحەممەد حەسسان) یەکێکە لەبانگخوازە هەرە بەناوبانگەکانی جیهانی ئیسلامی، باسی رووداوو بەسەرهاتی گەنجێکی (ئەمەریکی) دەگێرێتەوەو دەفەرمووێ:

کۆمەڵێك موسڵمانی دانیشتووی (ئەمەریکا) کەلە ویلایەتی (کالیفۆرنیا) دەژیان بانگهێشتی منیان کرد تابچم لەو ویلایەتە بانگەوازی ئەو خەڵکە بێ دین و خوانەناسانە بکەمو رێگای راستیان پێ نیشان بدەم، کەچووم هۆڵێکی زۆر گەورەو فراوانیان بۆ ئامادە کردبووم و بانگەشەیەکی زۆر بەربڵاویان بۆکۆڕەکە کردبوو بۆیە خەڵکێکی یەکجار زۆر هاتبوون تەنها دانیشتوانی ناوهۆڵەکە نزیکەی (سێ هەزار) کەس دەبوو جگە لەوانەی بەپێوە لەناو هۆڵەکە وەستابوون و لەدەرەوەش بەهەمان شێوەبوو، بێگومان زۆربەی خەڵکەکە (ئەمەریکی) بوون، هەموو جۆرە بیروباوەڕێکی تێدابوو لە(مەسیحی) و(جولەکە) ڕەش پێست...هتد.

منیش دەستم بەووتارەکەم کردو لەو ووتارەدا باسی ئەرکی مرۆڤ بەگشتی موسڵمان بەتایبەتیم کرد لەو دونیایەو دوارۆژی ئەو مرۆڤەو موسڵمانە لەدوارۆژدا کرد، ووتارەکە کاری لەزۆربەی ئامادەبووەکان کردو بەشێکی زۆر ئەو خەڵکە یا دەگریا یا فرمێسك لەچاوەکانی قەتیس مابوو، بەڵام گەنجێکی ڕەش پێست بەشێوەیەکی ئەوتۆ دەگریا گریانەکەی سەرنجی هەر هەموو خەڵکەکەی ڕاکێشابوو، لەبەر گریان وناڵەو نرکەکەی زۆرجار منیش قسەم پێ نەدەکرا، تا لەووتارەکەم بوومەوە سەیرم کرد زۆر بێ تاقەت و شەکەت بووە بۆیە هەر زوو چوومە لای لێم پرسی: بۆ وا دەگرییت چی بووە؟ زۆر بەبێ تاقەتی و بەهەناسە بڕکێوە ووتی: بەزمانی (ئینگلیزی) ووتی: (یاشیخ) تۆنازانی من چیم کردووەو تائێستا من وەك مرۆڤ نەژیاوم و تەنها کاری من ڕێگری و چەتەیی بووە تائێستا نەمزانیوە ژیان مانای چیەو چۆنە مامۆستای بەڕێز: دەستم لەملی کردو باوەشم لێیدا لەخۆشیان فرمێسك بەژاوەکانمدا دەهاتە

خوارەوەو قوڕگم پڕی گریان ببوو پێیم ووت: برای خۆم خودای گەورە زۆر بەڕەحمەو ڕەحمەتی زۆر فراوان و بێ سنووره لەبەندەکانی خۆش دەبێت هەرچەندی تاوان و گوناهیان زۆربێت و دوورکەوتبنەتەوە لێی و ئەو هەرلێیان خۆش دەبێت ، بەسۆزو میهرەبانی خۆیەوە بەرەو ڕوویان دێت چەندین ئایەتی پیرۆزەی خودای گەورەو میهرەبانم بۆی خوێندەوە بەتایبەت ئەوئایەتە پیرۆزەم بۆ خوێندەوەو ماناکەیم بۆ لێکدایەوەو: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ {سورەتی الزمر: ئایەتی ٥٣ } واتە: (ئەی پێغەمبەر(ﷺ) پێیان بڵێ: خوا دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم..ئەوانەی کەخۆتان گوناهبار کردووەو هەڵەتان زۆرە، نائومێد مەبن لەڕەحمەتی خوا، چونکە بەڕاستی ئەگەر ئێوە تەوبەی ڕاست و دروست بکەن، خوا لەهەر هەموو گوناهو هەڵەکانتان خۆش دەبێت، چونکە بێگومان ئەو خوایە زۆر لێخۆشبوو لێبووردەیەو زۆر بەسۆزو میهرەبانیشە)

ئینجا لەگەڵ خۆم بردم بۆ شوێنێك و وردە وردە باسی ئایینی ئیسلام و خودای گەورەو پێغەمبەری خودام(ﷺ) بۆی کرد، هەر چەندی ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەری خۆشەویستی دەبیست (ﷺ) زیاتر دەگەشایەوەو بەپەرۆشتر دەبوو بۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

دوایی ئامۆژگاری براکانی ئەو شوێنەم کرد کەبڕە پارەیەکی بۆ کۆ بکەنەوەو یارمەتی ماددی و مەعنەوی بدەن بەڵام ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ئەوە بوو کاتێ پارەکەمان پێیدا ووتی: نامەوێت ووتمان: ئەوە شتێکی زۆر سادەیەو مافی برایەتیمانە بەرامبەر یەکتر ئایینەکەمان داوامان لێ دەکات کەوابین بەرامبەر یەك، بەدەم گریانەوە ووتی: کاتێ من خودای گەورەم نەناسی بوو رزق و ڕۆزی دەدام و فەرامۆشی نەکردبووم، ئێستا کەدەی ناسم و لێی نزیکم چۆن رزق و ڕۆزیم نادات و فەرامۆشم دەکات.

دوای تەنها شەش مانگ جارێکی تر چوومەوە هەمان ئەو شوێنەو ووتارێکی ترم پێشکەش کرد، لەناو ووتارەکەدا ئەو برا ئەمەریکیەم بیرهاتەوە، دوای تەواوبوونی ووتارەکە

پرسیارم کرد لەو موسڵمانانەی ئەو شوێنەو کاتیَ ناونیشانەکەییم ووت ووتیان: ئا یاشێخ تۆمەبەستت فلاَن کەسە خاوەن کۆمپانیا ووتم: نەخێر کۆمپانیای چی ئەو کوڕە زۆر هەژارو نەداربوو تەنها پارەی یەك ژەم خواردنیشی نەبوو کاتیَ زیاتر ناونیشانەکەییم هەڵدا ووتیان: تەواو هەر کوڕەی تۆ باسی هەوە سەرم سووڕما نەم دەزانی بڕوا بکەم یان نا بەڵام دوایی هەستام بۆ خۆم چوومە کۆمپانیاکە کەچووم پرسیارم کرد ووتیان: ئەو بۆ خۆی بەڕێوەبەری کۆمپانیاکەیە ئێستا دەرچووە بەڵام خێزانەکەی لەشوێنیەتی، چوومە ژووری بەڕێوەبەری کۆمپانیا بینیم ئافرەتێکی باڵا پۆشی زۆر بەشەرم و شکۆ دانیشتووە وەك بلێی بەچکە موسڵمانە هەندە پابەندو دەسگرتوو بەئایینەکەی کە چوومە لای تەنها بەکوێرەی قسەی لەگەڵمدا کرد ووتی: فەرموو چ خزمەتێکت هەیە، منیش ناو نیشانی ئەو کوڕەم پێی ووت ووتی: ئەمە پیاوی منە چ کارێکت پێیەتی ووتم: تەنها دەمەوێت بیبینم لەقسەکان هەستی کرد من هۆکاری موسڵمان بوونی بوویمە، ووتی: تۆ فلاَن کەسی ووتم: بەلێَ ووتی: بەڕاستی تۆ چاکەت زۆرە لەسەر ئێمە منیش تەنها دووسیَ مانگێکە بویمە موسڵمان بەهۆی ئەو کوڕە گەنجەوە، باوکی من لەدەوڵەمەندترین کەسەکانی ئەو ویلایەتە بوو ئەم کۆمپانیایەو چەندین ماڵ و سامان و کارگەو کۆشك و تەلارو باڵاخانەی تری هەبوو تەنها منی هەبوو وەك منداڵ بۆیە کە مرد ئەو ماڵ و سامانە هەمووی کەوتە سەر ناوی من منیش بەهۆی ئەوماڵ و سامانە لەلایەك، لەلایەکی تر بەهۆی نەبوونی متمانەم بەهیچ کەس بۆیە نەم دەتوانی شوو بەکەس بکەم، بەڵام بەیانیەك بۆ ئەو کۆمپانیایە دەهاتم کاتیَ بینیم ئەو گەنجەی ئێستا پیاومە لەناو کۆمپانیا بوو منیش جانتایەك پارەم پێبوو بۆیە بۆیە زۆر ترسام و دلّم کەوتە لێدانێکی زۆر دەم ووت ئێستا نا ئێستا جانتاکەم لێدەبات و ڕادەکات یا پەلامارم دەدات بەڵام دوای ماوەیەك ئەو کوڕ هەری بلّند نەدەکرد بەڵکو سەری لەبەر خۆی نابوو لە دلّی خۆمدا ووتم: بیر دەکاتەوە چۆن هەلێك بقۆزێتەوەو زیانێکم لیَ بدات تا وا ڕێکەوت بەیەکەوە سواری بەرزکەرەوە(مەسعەد) ەکە بووین لە من و ئەو زیاتر کەسی ترمان لەگەڵدا نەبوو ترسەکەم زۆر زۆر زیاتربوو بەڵام سەیرم کرد ئەوکوڕە تەنها سەیرێکیشی نەکردم، زۆر سەیرم

پێی هات دەبێ بۆ سەیرم نەکات، خۆ ئەگەر پێویستی بەپارەش نەبێت ئەی بۆ سەیرم ناکات دەبێت ئەوەندە ناشیرین و قێزەون بم کەتەنها سەیرشم نەکات، بۆیە هەر چەندی بیرم کردەوە لەو کوڕە گەنجە رەش پێستە نەگەیشتمە هیچ سەرەداوێك کاتێ گەیشتینە شوێنی مەبەست ئەو هاتە دەر و منیش بەدوای ئەودا هاتمە دەر لەدەرەوە بەدەنگێکی نزم ز نەرم لەبەرە خۆیەوە بێ ئەوەی سەری بلند بکات ووتی: بێ زەحمەت بەڕێوەبەری کۆمپانیا لەکوێیە؟ منیش ووتم: من بەڕێوەبەری کۆمپانیام فەرموو چیت دەوێت؟

ووتی: من کەسێکی بێ کارم ئەگەر شوێنی بەتاڵ هەبێت بۆ کارکردن.

کەسەیرم کرد بینیم رەش پێستەو لەوانەی کاری رێگری و چەتەیی دەکەن، بەڵام بۆ ئەمە وایە نازانم!

پێیم ووتم: دابنیشە پێم نالێی تۆ بۆ سەیری من ناکەیت؟ ووتی: من موسڵمانم لەو ئایینەی ئیسلامدا حەرامەو دروست نیە پیاوی بیانی سەیری هیچ ئافرەتێك بکات جگە لە خێزانی خۆی کە لێی حەلالە.

کەئەمەم بیست گەورەیی ئەو ئیسلامەم بۆ دەرکەوت کەچ رێزێکی بۆئافرەت داناوەو ئافرەت لەو وولاتە لەچ بارودۆخێکی پڕ لە مەترسی و سوکایەتی پێکردن دەژین، ئافرەت وەك کاڵاو کەلی بازرگانی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت و هەزارەها رەش پێست وەك ئەو گەنجە کاری مافیایی و دزی و تاوان دەکەن بەڵام ئایینێك ئەو درندەیە بگۆڕێت بۆ ئەوجۆرە مرۆڤە بەراستی ئایینێکی گەورەو راست و دروست و گونجاوە بۆ ئەوەی بکرێت بەبەرنامەی ژیان و دەستوورو یاسای بەڕێوەبردنی کاروباری مرۆڤەکان.

بۆیە هەرزوو بریارمدا ببم بەموسڵمان و ئیسلامەتی خۆم لەسەر دەستی ئەو کوڕە بەڕێزە راگەیاندو، داواشم لەو گەنجە کرد کە بم هێنێت بەکوێرەی شەرعی ئیسلام، بەڵام ئەو گەنجە ووتی: من هیچ شتێکم نیە تا بیکەم بەمارەیی تۆو خەرجیت، منیش کاتێ ئەو موسڵمانەتیە نایاب و مەردایەتیەم لێی بینی ووتم هەرچی پارەوپووڵ سامانم هەیە دەیخەمە سەرناوی تۆ،

تۆخاوەنی من ماڵەكەشم بە ئیستا ماوەی چەند مانگێكە خۆشترین ژیان لەگەڵ یەك بەسەر دەبەین.

## ئەوەی جێی سەرنج و تێڕامانە:

* بۆچی خەڵكانی دوور لەو ئایینە ئاوا زوو شایەدی دەدەن بۆ گەورەیی و شكۆداری ئەو ئایینە پیرۆزە؟

* مرۆڤ لەئیسلامدا خۆی دەبینێتەوە.

* ئەوەی شتێك لەپێناوی خوادا وازلێ بهێنێت خودای گەورە باشترین قەرەبووی بۆ دەكاتەوە.

* سوپاس بۆ ئەو خودایەی بەر لەوەی ئەو بێ بڕوایانە موسڵمانان بناسن، ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەناسن.

*بیربكەوە لەرێك و پێكی و سەردانەواندنی ئەو گەنجە موسڵمانەی چەند مانگێكە موسڵمان بووە لەگەڵ ئەو گەنجانەی لەبنەڕەت و بنچینەوە بەناو موسڵمانن.

* گەورەیی هەست كردن بەچاودێری خودای گەورە .

بەرنامەیەكی تایبەت بەنەخۆشان لەومانگە پیرۆزەدا:

١ـ زۆر لەخۆت مەكە بۆبەرۆژوو بوونی ئەو مانگە، ئەگەر پزیشكێكی پسپۆری موسڵمان ووتی بەرۆژوو مەبە.

٢ـ دوعاو پاڕانەوەی نەخۆش وەركیراوە، بۆیە زۆر بپاڕێوە بۆخۆت بۆموسڵمان .

٣ـ سوپاسگوزاربەو ناشوكری مەكە.

٤ـ خێرو سەدەقە دەبێتە چارەسەری نەخۆشی، بۆیە زۆر خێرو سەدەقە بكە.

## بریاری گۆڕانكاری بدە:

ووردببەوەو بیربكەوە بزانە: پێش ئەو نەخۆشیەت چ خراپەو كردارێكی ناشەرعی ونادروستت كردووە، تۆبە یەكجارەكی لێ بكەو، پەشیمان ببەوە.

# خەلاتی بیست و نۆیەمین

## ((وقال الرسول یارب إن قومي اتخذوا هذا القرآن مهجورا))

مانگی ڕەمەزان و قورئانی پیرۆز دووشتی ئاوێتەی یەکترو، هەیەکێکیان تەواوکەری ئەوی ترە، ڕەمەزان گەورەو ڕیزدارو شەرەف مەندە چونکە قورئانی پیرۆزی تێدا دابەزیەو، کەوابوو تیشکی قورئانی پیرۆز بەرهەر شتێك بکەوێت و، لەهەر شتێك بدات ئەوشتە پرشنگدارو پیرۆزو گەورە دەبێت.

ژیان لەگەڵ قورئان و لەژێر سێبەری قورئان تام و چێژێکی هەیە مرۆڤ ناتوانێت بەزمان باسی بکات دەری ببڕێت مەگەر کەسێك بۆ خۆی لەناو ئەو نیعمەتەدا ژیابێت.

ژیان لەگەڵ قورئان ناخۆشی و دەردو بەڵا لادەبات و سووك دەکات، خراپەو تاوان ڕەش دەکاتەوە، تای تەرازووی چاکەکاری گران و قورس دەکات.

ڕۆژووەوانانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز: فەرموون بابەیەکەوە کوێ لەم چیرۆکە بگرین:

دەگێڕنەوە پیاوێکی پیرو بەساڵاچوو دیندارو خواناس، هەموو ڕۆژێك زۆربەی کاتەکانی خۆی بەقورئان خوێندن بەسەر دەبرد بەتایبەت دوای نوێژی بەیانیان بەدەنگە گران و نەغمەی قوڕگە پڕ لەجۆش و خرۆشەکەی قورئانێکی زۆر بەکاریگەری دەخوێند، ئەو پیرە پیاوە نەوەیەکی هەبوو گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بوو، زۆرجار بەو باپیرەی خۆی دەوت باپیرە گیان: نازانم بۆچی من کە قورئان دەخوێنم کارم تێ ناکات و سودی لێ نابینم؟

باپیرەش لەوەڵامیدا پێی دەوت: ڕۆڵە تۆ بەردەوامبە هەر ڕۆژێك دێت سودی لێ دەبینیت و کاریگەری دەبێت.

ناوەناوە ئەم گەنجە ئەم پرسیارەی لە باپیرەی دووبارە دەکردەوە بەتایبەت کاتێ کە قورئان خوێندنی باپیرەی دەبینی.

ڕۆژێك ئەو گەنجە ژیرە جارێکی تر ئەو پرسیارەی لەباپیری کردەوە باپیریشی ویستی وەڵامێکی وای بداتەوە کەتا ماوە لەبیرو مێشکی بمینێت و هەرگیز لەبیری نەچێتەوە بۆیە

بەشێوەی پەندئاسا بەکردار پێی سەلماند کـە قورئـان چ کاریگەریـەکی گـەورەی بەسـەر دڵ و دەروون ناخر مرۆڤ.

کەونە تەنەکەیەکی کۆنی کون لەویٚ کەوتبوو کەهەموو جار مشکی و خەلووزیان پیٚ فڕیٚ دەدا لەناو ئاگردانەکەیان باپیرە ووتی: ڕۆڵە گیان بەو تەنەکە بڕۆ لەڕووبارەکـە پڕیکـە لـەئاوو بیهێنەوە ئەو گەنجەش دەستیدا تەنەکەکەو هێنایـە لای بـاپیرەی و ووتـی: بـاپیرە گیـان ئـەم تەنەکە کونەو ڕەشە باپیرەش ووتی: قەیناکا ڕۆڵە گیان من چیت پیٚ دەڵێم وابکـە بۆیـە ئـەو گەنجە بەڕێزە بیٚ سیٚ دوو دەستی دایە تەنەکەکەو چووە سەر زێیەکە پڕی کرد لەئاوو بەڵام تـا گەیشتەوە لای باپیرەی هیچ ئاوی تێدا نەمابوو، چەندین جار باپیرەی ئەو کارەی پـیٚ دووبـارە کردەوە تا لەکۆتاییدا بانگی نەوەکەی کردو پێی ڕۆڵە گیان سەیری ئەم تەنەکە بکە بزانە هیچ ڕەشایی پێوە ماوە ئایا خاوێن بۆتەوە یان نا؟ ووتی: بەڵیٚ خاوێن بۆتەوە ووتی: کەوابوو بزانـە ڕۆڵەگیان قورئانیش بەم جۆرە کاریگەری و سوودی هەیە لەسەر دڵ و دەروون وناخمان.

کەوابوو براو خوشکی موسڵمان با لەو ڕەمەزانەوە بریار بدەین:

* ئەگەر تا ئێستا قورئانی پـیرۆزت بـەڕەوانی و تـەواوی خـەتم نـەکردووە، بـەڵێن بـدە نەگەیتەوە ڕەمەزانی داهاتوو هەموو قورئانی پیرۆزت بەتەواوی و ڕەوانی خوێند بێت، ئەویش هەوڵبدە هەفتەی چەند ڕۆژێك دیار بکە لای کەسێکی قورئان خوێن و شـارەزا ڕۆژانـە چـەند ئایەتێکی لا بخوێنە.

* قورئان خوێندن لای خۆمان بە زەحمەت و گران نەزانین، چـەنکە خـودای گـەورە خـۆی بەڵێن داوە ئەوەی هەوڵبدات خۆی شارەزا بکات لەقورئان خـودای بـۆی ئاسـان دەکـات وەك دەفەرمووی: ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾ {سورەتی القمر: ئایـەتی ١٧} داتـە: (بێگومان ئێمە قورئانمان ئاسان کردووە بۆ(خوێندنەوەو تێگەیشتن و) ئامۆژگاری وەرگرتن، جا ئایا کەسێك هەیە کەدەرکی حەقیقەت و ڕاستی بکات و پەندی وەرگرتبێت).

* هەوڵبدە بەردەوام بیٚ پچڕان دۆست قورئان بیت و لێی دانـەبڕێیت، ڕۆژانـە پـشکێکی دیاری کراوت هەبێت بۆ قورئان خوێندن و خۆ شارەزا کردن لەزانستەکانی قورئانی پیرۆز.

* هەوڵبدە لەو مانگی ڕەمەزانەدا زۆر ترین کـاتی خـۆت بـە قورئـان خوێنـدن بەسـەر ببەیتو، پێش هاتنی مانگی ڕەمەزان بەرنامەیەکی وا دابڕێژە کەبـەلای کـەم دووسـێ خـەتم بکەیت، ئەگەر بەم شێوە قورئان بخوێنی: کاتی پارشێو خواردن نیو جوزءبخوێنە، دوای نوێـژی بەیانی نیو جوزءبخوێنە دوای تا پێش نوێژی (عەسر) نیو جوزءبخوێنە، دوای عەسر تا مەغریب جوزئێکی تەواو بخوێنە، شەوانیش هەوڵبدە نیو جوزئی تر بخوێنە، ئەگەم بەرنامەیـە پـەیڕەوو جێ بەجێ بکەیت سێ خەتمی تەواو دەکەیت.

* برای خوێندەوارو ڕۆشەنبیر باچەند تەفسیرێکی کوردی کـورت و پوخـت لەماڵەکەتـدا هەبێت.

* برای خۆشەویست و گەورەم چەند کتێبێکی ئیعجـازی زانـستی قورئـانی پـیرۆزت بـا ماڵدا هەبێت و، بخوێنەوەو زۆر پێویستە موسڵمان شارەزا بێت لەو بابەتانە.

* براو خوشکی سەنگین لەم ڕەمەزانەوە هەڵوەستەیەك بکەو، ووردببەوە لەخۆت و ماڵ و منداڵ و ژیانی ڕۆژانەت، بزانە چ شتێکت پێچەوانەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزە جێ بـەجێت نەکردووە جێ بەجێی بکە.

* لەکاتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز هەڵوەستە لەسەر ئایەتە کاریگـەرو ترسـێنەرەکان بکە.

زۆر خۆ خەریك کردن بەقورئانی پیرۆز سوونەتی پێغەمبەری ئەکرەم و(ﷺ) پیاوچـاکان و زاناو دانایان بووە خاتوو (عائیشە)ی دایکی بەڕێزمان دەفەرمووێت: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) هەموو ڕەمەزانێك جارێـك لەگـەڵ گـەورەمان (جوبرائیـل) پێداچـوونەوەی قورئـانی پـیرۆزی دەکرد، تەنها ئەو ساڵەی تێیدا وەفاتی فەرموو لەو ڕەمەزانەدا دووجار پێداچوونەوەی قورئانی پیرۆزیان کرد.

پێشەوا (مالیك) ڕەمەزانان وازی لەهەموو وانـە ووتنـەوەو جالاکیـەکی خـۆی دەهێنـاو تەنها خۆی خەریکی قورئانی پیرۆز دەکرد، دەی فەرموو: ئەو مانگە مانگی قورئانە.

## * چۆن بەهرەمەندو سوودبەخش دەبین لە قورئانی پیرۆز:

١ـ بەخوێندنەوەی لێ دانەبڕان و خۆ نزیك کردنەوەو بوونە دۆستی قورئانی پیرۆز.

٢ـ خۆ شارەزا کردن لەماناو زانست و زانیاریەکانی.

٣ـ دوعا پێ کردن و پاڕانەوە بەئایەتە پیرۆزەکانی.

٤ـ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی .

٥ـ لەکاتی نەخۆشی و ناخۆشی پاڕانەوە کردن بەئایەتە شیفا دەرەکانی وەك سورەتی(الفاتیحە) و، ئایەتی(کورسی)، هەردوو سورەتە پارێزەرەکان سورەتی (الفلق) و (الناس).

* واچاك وباشە ئەو دوعاو پاڕانەوانە موسڵمان بۆ خۆی ئەنجامی بدات و، نەوەك بچێتە لای خەڵك و داوا لەخەڵك بکات بۆی بخوێنێت و بنوسێتەوە.

## بەرنامەت لەو رەمەزانە پیرۆزەدا:

١ـ قورئانی پیرۆز (خەتم) بکە.

٢ـ وردە وردە سورەتە بچوکەکان لەبەر بکە.

٣ـ خۆت فێری ئەحکامەکانی باش خوێندنەوە (تەجوید) بکە.

## بریاری گۆڕانکاری بدە:

بیربکەوەو بزانە لەکاتی کێشەو گرفتەکانت بۆچارەسەری کێشەو گرفتەکانت دەگەرێیتەوە بۆلای قورئانی پیرۆزو

یاخود بەو حوکم و یاسایە رازی کەلە بەرژەوەندی و قازانجت دایە، بزانە لەناو خێزان ومنداڵ و ماڵەکەت چەند قورئانی پیرۆزتان پەیرەو کردووە.

# خەلاتی سییەمین

## ڕەمەزان چی پێ دەووتین ئەگەر بهاتبایە قسە؟!

کاری چاکەو خێر کردن بە تواناو هێزو زانست و زانیاری دانـایی ولـەباربوونی بـارودۆخ و بۆگونجان نیـە، بـەڵکو بەهیممـەت و ئیمانـداریتی ویارمـەتی و پـشتیوانی خـودای گـەورەو میهرەبانە، گەورەیی و شـکۆمەندی هـەموو کـارێکیش بـەکوێرەی دڵـسۆزی و خۆیـەکلایی کردنەوەی کارکردەیە بۆ خودای گەورەو میهرەبان.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵەکانی بۆ جەنگێك دەرۆیشتن بـەڵام ئـەم سـوپایە زۆر جیاواز لەگەڵ سـوپاکانی سـەردەمی نـەفامی زۆربـەرێزو سـەنگینیەوە بەرێـدا دەرۆیـشتن و لەجیاتی دەپل لێدان و گۆرانی ووتن ئەوان دەم بەزیکرو یەك لـەدوای یـەك دەرۆیـشتن بەئـەو ڕێکوپێکییەوە دەرۆیشتن، بۆیە پیاوێکی دەشتەکی شـوانکارە کـاتێ ئـەم سـوپایە دەبینێـت دەچێتە لایان و لێیان دەپرسێت ئێوە چین؟ دەڵێن: موسڵمانین. دەڵێت: موسـڵمان مانـای چـی یە؟ دەڵێن: ئێمە خاوەنی ئایینێکین کە پێی دەوترێت ئیسلام و خودای گـەورە پێغەمبـەرێکی بۆ ئێمە ناردووە هەموو شتێکی باش و چاکی فێر کردین و هەموو خراپەکاریەکی لێ بـەدوور خستینەوە، ووتی: چۆن دەبم بە یەکێك لە ئێوە ووتیان شەهادە بێنەو بڵـێ: (أشـهد أن لا إلـه إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله) ئەو پیاوە بووە موسڵمان پاشـان ووتـی: ئێـستا چ شـتێك لەسەر من پێویستە بیکەم ووتیان: ئێستا ئێمە لەڕێگای غەزاو تێکۆشـانین لـەپێناو خـودای گەورە ئەو پیاوە لەگەڵ موسڵمان بەڕێ کەوت بۆ گۆڕەپانی جەنگ دەستی بەشەڕ کردن کـردو چەندی کەسی لەپێشی خۆی کوشت دوایی خۆشی شەهیدبوو.

ئینجا پێغەمبەری سەردار(ﷺ) فەرمووی: ((عمل قليلا وأجر كثيرا)) واتە: (کردەوەیـەکی کەمی ئەنجامداو پاداشتێکی زۆری بەدەست هێنا).

ئەو هاوەڵەبوو بێ ئەوەی یەك سەجدە بۆ خودای گەورە ببـات پلـەی شـەهیدی بەدەسـت هێنا.

## وەسیەت و ئامۆژگاریەکانی ڕەمەزان بۆ دۆستان و ڕۆژووەوانانی:

ڕەمەزان پێمان دەڵێت: خۆشی لەخۆت من شایەدیت بۆ دەدەم لەڕۆژی دوایی لەسەر: بەڕۆژووبوون و شەوونوێژو قورئان خوێندن وماڵ بەخشین و شەوانی قەدر..هتد بەیەك گەیشتنەوەمان گۆڕەپانی حەشرە.

ڕەمەزان پێمان دەڵێت: خۆشی لەخۆت ئەم ساڵەش بەیەك شاد بوینەوە هەرخودا دەزانێت ساڵێکی بەیەك دەگەینەوە یانا.

ڕەمەزان پێمان دەڵێت: خۆشی لەخۆت پاك بویتەوەو گوناهت لەکۆڵ بویتەوەو پاداشتت کۆکردۆتەوە بەبای مەدە.

ڕەمەزان ئێمان دەڵێت: خۆشی لەخۆت خوشکی بەڕێز سەرپۆش و بەرگە شەرعیەکەت فەرمانی خودایە تامردن وڕۆژی دوایە تایبەت نیە بەمن بۆ من مەیکە تەنها من لێم ڕاهینای .

ڕمەزان پێمان دەڵێت: خۆشی لەخۆت ئەوە دینداری موسڵمانیەتی ڕاستەقینەیە دەستی پێوە بگرە.

ڕەمەزان پێمان دەڵێت: خۆشی لەخۆت دەم بەزیکرو خەندە بووی ئەو بازرگانیەت بەردەوام بێت، چونکە چاکترین و پارێزەرە.

ڕەمەزان پێمان دەڵێت: خۆشی لەخۆت فیری ڕۆژووم کردی ترسم شکاندی لەڕۆژگار درێژو گەرم بەڕۆژوو بووی بەردەوامبە ئاگاداری ڕۆژووە سوونەکان بە.

ڕەمەزان پێمان دەڵێت: خۆشی لەخۆت من ڕۆژە خۆش و یادەوەریە پڕ لەسەربەرزی و سەرفرازیەکانی وەك ڕۆژی بەدرو یەرموك و حیتتینم بیر هێنایتەوە تا بیر لە حاڵی ئیسلامو موسڵمانانی ئێستا بکەیتەوە.

کۆتا ئامۆژگاری ڕەمەزان دەڵێت: دەرگاکانی بەهەشتم بۆ کردنەوەو، دەرگاکانی دۆزەخم بۆ داخستن و، شەیتانەکانم بۆکۆت و زنجیر کردن، نەکەن کەڕۆیشتم و جێتام هێشت دەرگاکانی

بەهەشت لەخۆتان دابخەن، دەرگاکانی دۆزەخ لەخۆتان بکەنەوە، کلیلی کۆت و زنجیرەکان بدەنە دەست شەیتان .

## * جیاوازیەکانی ئەم ڕەمەزانە لەگەڵ ڕەمەزانانی ساڵانی پێشوو:

ڕەمەزانی ڕابردوو چەند جار قورئانت خەتم کرد لەم ڕەمەزانەدا شتێك زیاتر بکە.

ڕەمەزانی ڕابردوو چەند ڕۆژ نوێژی تەراویت لەمزگەوت ئەنجامدا ئەم ڕەمەزانە زیاتری بکە.

ڕەمەزانی ڕابردوو چەند زیکرت لەبەر کردوو بەردەوام دەیان لێیتەوە ئەم ڕەمەزانە زیاتری بکە.

ڕەمەزانی ڕابردوو دڵی چەند هەژارو نەدارت خۆش کرد ئەم ڕەمەزانە هەژاران چاوەڕوانی هیممەتی زیاترن.

ڕەمەزانی ڕابردوو چەند شارەزای بیروباوەڕی خۆت بووی لەم ڕەمەزانە زیاتر فێربە.

لەکۆتاییدا ئەگەر ئەم ڕەمەزانەت باشتر نەبێت لەڕەمەزانی ڕابردوو زەرەرمەندو دۆڕاوو پەشیمانی.

ئایا ئەمە ژیرە؟!

کەسێك نەخۆشی و دەردو بەڵای زۆر ڕووی تێ کردووە، هەرچی هێزو توانا هەیە نەی ماوە دوای سەردانی کردنی چەندین نەخۆشخانەو پزیشك بەڵام هەر نەگەیشت بەئەنجامو چارەسەری نەخۆشیکەی تا ئەو کاتەی بێ ئومێدو هیوابوو، بەڵام لە ناکاو ناونیشانی نەخۆشخانەیەکی زۆر گەورەو باشیان پێ ووت: کەچارەسەری هەموو نەخۆشی ودەردێکی تێدایە، ڕووی لەو نەخۆشخانە کرد، ئەو نەخۆشخانەیە هەرهەموو دەرگاکانی لەسەر پشت بوو، سەرەتا لەگەرماوێکی زۆر خۆش و باش خاوێنیان کردەوەو بەرگە پیس و رزیوەکانیان بۆ گۆڕی بەبەرگێکی نوێ وجوان و بۆن خۆش ئینجا سەردانی هەموو بەشەکانی ئەو نەخۆشخانەیان پێ کرد، لەهەر بەشێك چارەسەری تەواویان پێیدا ، تاتەواو چاك بۆوەو هەرچی

نەخۆشی و دەردە نەی ما لەکۆتاییدا چەند ئامۆژگاریەکیان کرد ووتیان: پێویستە ئەو پارێزی لەو شتانە بکەیت ئەگینا ئەو نەخۆشیانەت بۆ دەگەڕێتەوەو بـۆی هەیـە ئـەم جـارە لـەناوت ببات.

دوای ماوەیەکی کەم ئەم نەخۆشە بە گوێی پزیشکەکەی نەکات و پارێزیەکان بشکێنێت و بمرێت !

تۆ چ بەم جورە کەسانە دەڵێیت؟

یاخوشکی گەورەم: ئایا تۆ ئەم ئافرەتە بە ژیرو هۆشمەند دادەنێیت ؟! کە خاوەنی کۆمەڵێ مندالّی بێ باوك بێت هیچ سەرچاوەیەکی ژیانیان نەبێت تەنها بۆ خۆی کاری رستن دەکـات و خووری دەکات بەریس دوای ماندوو بوون خووریەکەی کەکرد بەڕیس بیبات بۆ بازاڕ تا بـژێوی خۆی و منداڵەکانی پێ دەستەبەر بکات بەڵام لەبازاڕ دوای پارەو نرخێکی باش بـەو ڕیـسەی بدەن نەی فرۆشێت و بگەڕێتەوە ماڵ جارێکی ڕیسەکە بکاتەوە خووری هەڵی بوەشێنێتەوە !

کەوابوو دەڵێم تۆ وەك منداڵە بێ دەسەڵاتەکانی ئەو ئافرەتە ڕۆژێك دادێت بـێ دەسـەڵات بێ هێز دەبیت هێزو تواناو پاڵپشتیت تەنها لە چاکەکانتە ئەگینا هیچت نـەماوەو هـەمووت لەدەستداوە، کەوابوو بۆ پارێزگـاری کـردن لـەو کـردەوەو چـاکانەی خـۆت و زیادکردنیـان و گەشەپێ کردنین بەردەوامبە و دامەبڕێ بۆت دەبێتە چراو ڕووناکی و پارێزگـارو پـشتیوان بـۆ ڕۆژی تەنگ وتاریك پڕ لەزەحمەتی:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ﴾ {سورەتی فصلت: ئایەتی ٣٠ـ ٣٢} واتە: (ئەوانەی بەڕاستی ووتیان: پەروەردگارمان (الله)یە، لەوەودوا بەردەوام پابەندی ئەو ڕێبازە ڕاستەبوون، ئەوە لەسەرە مەرگدا دەستە دەستەفریشتە دادەبەزن بۆ لایان، پێیان دەڵێن: هیچ ترس و بیمێکتان نەبێت لەداهاتوو، هیچ

غەم و پەژارەیەکتان نەبێت بۆ رابردوو، مژدەتان لیّ بێت بەو بەهەشتەی کە کاتی خۆی بەڵێنتان پیّ دەدرا * (خوای گەورە و فریشتەکانیش دەفەرموون): ئێمە یارو یاوەرو هاوکارو پشتیوانی ئێوەین لەژیانی دونیاو قیامەتیشدا مژدەتان لیّ بێت لە بەهەشتدا هەرچی ئارەزووی دەکەن و داوای دەکەن بۆتان ئامادەیە * ئەو بەهرەیەش لەلایەن پەروەردگارێکەوە پێشکەشتان دەکرێت کەلێبووردەو میهرەبانە)

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾ {سورەتی الأحقاف: ئایەتی١٣-١٤} واتە: (بەڕاستی ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارمان ـ ألله ـ یەو، پاشان پابەندی ئەو ئیمانە دەبن و ڕاست و ڕەوان پەیڕەوی دەکەن و لەسەری بەردەوامن، ئەوانە هیچ جۆرە ترس و بیمێکیان لەسەر نیەو دڵتەنگ نابن).

## بەرنامەی ڕۆژووەوان:

١ـ زۆر بڵیّ: ((اللهم أعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك)) ئەو دوعایە هەرگیز لەبیر مەکە.

٢ـ هەروەها زۆر بڵیّ: ((اللهم يامقلب القلوب ثبت قلبي على دينك)) .

بڕیاری گۆڕانکاری بدە:

ئەگەر تائێستا سەیری کەناڵی خراپ و فلیم و تەمسیلی ناڕێك و نادروستت کردووە، لەو مانگە پیرۆزەوە بڕیار بدە نەخۆت و نەخێزان و منداڵەکانت بەهیچ شێوەیەك سەیری ئەو کەناڵ تەمسیل و فلیمە ڕووت و ناڕێکانە نەکەن.

# ناوەڕۆک

بابەت | لاپەڕە

پێشەکی ........................ ٥
خەڵاتی یەکەم: وا هات مانگی میهرەبانی ........................ ٩
* چۆن پێشوازی لەومانگە پڕ لەخێرو پیرۆزە: ........................ ١٣
خەڵاتی دووەم: برووسکە خێراکان ئاسمانەکان دەبڕن ........................ ١٥
* ئەو کاتانە لە مانگی ڕەمەزان بە هەل بزانە بۆ دوعاکانت: ........................ ١٩
خەڵاتی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بۆ ڕۆژووەوانان: ........................ ٢٠
خەڵاتی سێیەم: پلانت بۆ ئەو وەرزە پڕ لە خێرە ........................ ٢١
ئەگەر دەتەوێت لە زەرمەرمەندو دۆڕاوان نەبیت: ........................ ٢٣
خەڵاتی چوارەم: فراوانی ڕەحمەتی خودا ........................ ٢٥
گەنجینەی زانیاری: ........................ ٢٨
ڕەحمەتی خودای گەورە لە بێشکەوە تا دوا مەنزڵگا: ........................ ٢٨
خەڵاتی پێنجەم: ڕەمەزان مانگی ڕاستکردنەوەی هەڵە گەورەکانی ژیانە ........................ ٣١
* بەرنامەت لەدوای نوێژی بەیانی تا ڕۆژهەڵات: ........................ ٣٥
خەڵاتی شەشەم: کاتێ دێنت نەبێ ڕێزیشت نابێ ........................ ٣٧
خەڵاتی حەوتەم: بەخشین باشترین چارەسەرە بۆ نەخۆشانی بێ هیوا ........................ ٤٣
خەڵاتی هەشتەم: منداڵێکی بچوک دەبێتە ڕێنموونی کاری باوکی ........................ ٤٩
خەڵاتی نۆیەم: نرخی تۆ بەهەشتە خۆت هەرزان فرۆش مەکە ........................ ٥٧
خەڵاتی دەیەمین: لە لێبووردەیی خودای گەورە فێری لێبووردن بە ........................ ٦١
خەڵاتی یازدەهەم: ئایا دەزانی خودای گەورە حەز دەکات لێت خۆشبێت ........................ ٦٧
* بەرنامەیەکی تایبەت بەزیکری (ئیستیغفار): ........................ ٧٢
خەڵاتی دوانزەهەمین: ئەو خۆشیەی تێیدای بیبەخشە ........................ ٧٣
* گرنگترین ئاکارو ڕەوشتەکانی بانگخواز: ........................ ٧٧
بەرنامەی ڕۆژووەوان: دوای نوێژی (عیشا): ........................ ٧٨
خەڵاتی سێزدەهەمین: ئەو گەنجەی لەگەڵ پێشێل کردنی مافی خودا مافی دایکیشی پێشێل کرد ........................ ٨١
* چۆن بەچ شێوەیەك دڵ و دەروونی دایك و باوکمان خۆش بکەین: ........................ ٨٦
خەڵاتی چواردەهەمین: بەڵگەی خۆشەویستی پێغەمبەرەکەت چی یە؟ ........................ ٨٩
بەرنامەی کاسبکارو پیشەداران لەو مانگە پیرۆزەدا: ........................ ٩٥

خەلاتی پازدەهەمین: گەنجان بوکێکی ڕازاوە چاوەڕوانتە ........................ ٩٧
خەلاتی شازدەهەمین: ئاگاداری میوانی لە ناکاو بە ........................ ١٠٧
خەلاتی حەڤدەهەمین: جەنگی بەدر لەمانگی جەنگی دەروونیدا ........................ ١١٣
جەنگی بەدر بۆچی هەڵگیرسا؟ ........................ ١١٥
خەلاتی هەژدەهەمین: چۆن پلە بەرزەکانی بەهەشت بەدەست دێنیت ........................ ١١٩
خەلاتی نۆزدەهەمین: ئافرەت لەئیسلامدا شاژنە ........................ ١٢٧
ئامۆژگاری بۆخاوەن کچ وسەرپەرشتیارانی کچ: ........................ ١٣٠
خەلاتی بیستەمین: خۆشویستن یا خۆکوشتن ........................ ١٣٥
خەلاتی بیست و یەکەمین: خۆت بگەیەنە ئاستی فریشتەکان ........................ ١٤٣
خەلاتی بیست و دووەمین: لەماڵی پێغەمبەر(ﷺ) ڕەخنە دەبێتە خەندە ........................ ١٤٩
* هۆکارە چارەسەریە پارێزەرەکانی ناو ماڵی موسڵمان: ........................ ١٥٣
خەلاتی بیست و سێیەمین: پارێزگاری ناموسی خێزانەکەت لەسەر تۆی پیاوە ........................ ١٥٧
بەرنامەی ڕۆژووەوان بۆبەربانگ کردنەوەوە: ........................ ١٦٠
خەلاتی بیست و چوارەمین: ئایا دەزانی ئەمانەتی هەرە گەورە چی یە؟ ........................ ١٦١
بەرنامەی ڕۆژووەوانی کاسبکارو پیشەکاران لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز: ........................ ١٦٤
خەلاتی بیست و پێنجەمین: وولاتی سودان پڕە لەسوودان ........................ ١٦٧
بەرنامەی ڕۆژووەوان: ........................ ١٧٢
خەلاتی بیست و شەشەمین: گەنجە دڵنەرم و خزمەتگوزارانی ڕۆژووەوانان ........................ ١٧٣
خەلاتی بیست و حەوتەمین: تام وچێژ وەرگرتن لەنوێژ ........................ ١٧٧
بەرنامەی ڕۆژووەوان سەبارەت بەنوێژە سووننەتەکان: ........................ ١٨٢
خەلاتی بیست و هەشتەمین: تۆلەکردنەوەی خودای گەورە دەبێت چۆن بێت؟! ........................ ١٨٣
خەلاتی بیست و نۆیەمین: ((وقال الرسول یارب إن قومي اتخذوا هذا القرآن مهجورا)) ........................ ١٨٩
خەلاتی سییەمین: ڕەمەزان چی پێ دەووتین ئەگەر بهاتبایە قسە؟! ........................ ١٩٣
وەسیەت و ئامۆژگاریەکانی ڕەمەزان بۆ دۆستان و ڕۆژووەوانانی: ........................ ١٩٤
* جیاوازیەکانی ئەم ڕەمەزانە لەگەڵ ڕەمەزانانی ساڵانی پێشوو: ........................ ١٩٥
بەرنامەی ڕۆژووەوان: ........................ ١٩٧
ناوەڕۆک ........................ ١٩٩

# (30) سی خەڵاتی ڕەمەزان

ئەم کتێبە:

* باس لە گەورەیی و شکۆمەندی مانگی ڕەمەزان دەکات.
* باس لە کاریگەری مانگی ڕەمەزان دەکات، لەسەر تاك و کۆمەڵ.
* دەروازەیەکە بۆ گۆڕانکاری کردن و داهێنان لە ژیان و ژیان بەسەر بردن.
* باس لە ناوەڕۆك و مەبەستی سەرەکی بەندایەتی و پەرستشەکان دەکات.
* لاکردنەوەیەکە لەتەمەنی بەباچووی ڕابردوو، بەرنامەڕێژیەکە بۆ تەمەنی داهاتوو.
* زیاتر لە (٣٠) سی چیرۆك و بەسەرهاتی لەخۆ گرتووە ، کە هاندەرە بۆ گۆڕانکاری و داهێنان.

لەدوعای خێر بێبەشمان نەکەن